﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم ﴾

## پێشەکی:

**إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونسترشده ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لاإله إلاالله وحده لاشريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله أما بعد:**

زانای بەرز (إبن قيم) خوا لێی رازی بێت، یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکانی جیهانی ئیسلامیی قوتابی قوتابخانەی (أبن تيمية) خوا لێی رازی بێت.. چەندە نوسراوە و باسی ئیسلامیی بەنرخی هەیە، وە یەکێك لەو نوسراوە نایابانە پەرتوکی (عدة الصابرين..)ە نوسراوێکی زۆر رۆحی و بەتام و چێژە چارەسەری چەندەها گیروگرفتی ژیان دەکات بەشێوەیەکی زانیاری و رۆحی کە نەڕوخاندن و بێ ئاوات نەبوونو دروست نەبوونی خەم و خەفەت و سستی و دروست بوونی غیرەت و توانا و هەوڵ و چەند هاکاری تری ئیمانی وەکو نەکردنی بەندەیی بۆ مادده و رۆنەچوونە لەبریق و باقەکانی دنیادا کە کاری ئەم نوسینەیەتی لەناخی خوێنەردا وە ئەم نووسراوە بریتییە لە پێناسەی ئارامگرتن و چەندەها بەڵگە و نمونەی راستەقینەی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) و یارانی وە بیروهەست و نەستی هەژارە ئارامگرەکان دەربارەی دونیا و رۆژی دوایی.. وە باوەڕو ویستو لەخواترسی دەوڵەمەندە سوپاسگوزارەکان کە هەردوولایان تێکڕا هەوڵدەرن بۆ رۆژی دواییان.. وە هەر لەم نوسراوەدا یەکلابوونەوەی باسێکمان بۆ بەئەنجام دێنێت کە راوبۆچوونی زانایانی زۆر لەسەر بووە ئەویش (ئایا

دەوڵەمەندێکی سوپاسگوزار باشترەو پلەی بەرزترە لای خوا یا هەژارێکی ئارامگر. وە بۆ پشتگیریی لە بابەتە هەندێك بەسەرهات و فەرمودەم بۆ زیادکردووە لەهەندێك پەرتووك لەگەڵ دانی سەرچاوەکەدا وەدەرکردنی زۆر دووبارەبوونەوەی هەندێك بابەت و نەنووسینی هەندێکی تر لەبەر وردەکارییەکی عیلمی کە هەموو کەس پێویستی پێی نییە وە ئیتر ئەوەندەی بەباش و بەکەڵکم زانیبێت لەباسەکەدا لێم وەرگێڕاوە بەدەستکارییەوە وە هیوام وایە شوێنی رەزامەندی خوای گەورە بێت وە خوێنەریش بێ بەشمان نەکات لە دوعای خێر لەگەڵ ئەو کەسانەی کە ئەرکی پیاچوونەوە و نووسینەوەیان لەپێناودا چەشتووە.

أحمد فائق سعيد

٤/رجب/١٤١٤ کۆچی

١٩٩٤/١٠/٢٤ زاینی



بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم

# ئارامگرتن ﴿ الصبر ﴾

(الصبر) لەزمانەوانیدا: واتای (المنع) گرتن وەنەهێشتن. لەپێناسەدا: واتای گرتنـــی دەروون لەنارەحـــەتی وە زمـــان لـــە ســـکاڵا وە ئەندامـــەکانی لاشـــە لەیەخەدادڕین و رنینەوەی قژ و روومەتو..

واتای (صبر) زانایان بەچەندەها جۆر واتایان لێکداوەتەوە وەك هەنـدێکیان دەڵێن: (رەوشتێکی بەرزی دەروونە کە بەربەرەکانی ئەکات بەرامبـەر هـەموو کردارێکی ناڕێك و ناپەسەند) لەوانەش:

❖ (جونەید/ خوا لێی رازی بێـت) دەفـەرموێت: چەشـتنی تـاڵی بـەبێ پێناخۆش بوون.

❖ (زونون/ خوا لێی رازی بێـت) دەفـەرموێت: دەربڕینـی دەوڵەمەنـدی لەکاتی هەژاری لەگۆڕەپانی ژیاندا.

❖ (عەمری کوڕی عوسمان/ خوا لێی رازی بێت) دەفەرموێت: ئارامگرتن لەگەڵ خوادا بەرامبەر بەڵاکانی.

❖ (خواص/ خوا لێی رازی بێت) دەفەرموێت: راوەستان بەرامبەر یاسای قورئان و سووننەت.

❖ (عومەری کوڕی خەتاب/ خوا لێی رازی بێت) دەفەرموێت: باشـترین ژیان بە ئارامگرتن دەستمان کەوتووە.

❖ (إبن قيم)[1] دەفەرمویێت: ئارامگرتن لەسەر پەیڕەوی و فەرزەکانی خواو ئارامگرتن لەسەر ئارەزووی دەروون.

❖ وە دەفەرموون: بەربەرەکانی کردنی دوو لایەنی بەرامبەر دین و ئەقڵ بەرامبەر ئارەزووی دەروون.

❖ شێخ عەبدولقادری گەیلانی دەفەرمویێت: ئارامگرتن لەسەر سێ شت بەندە:

١ـ ئارامگرتن لەسەر فەرمانەکانی خوا (وەکو نوێژ و رۆژوو .. هتد).

٢ـ ئارامگرتن لەسەر ئەوانەی کە خوا فەرمانی بەنەکردنی داوە.

٣ـ ئارامگرتن لەسەر قەزا و قەدەر.

وە هەر ئەو سیانەیە کە لوقمان (خوا لێی رازی بێت) ئامۆژگاری کوڕەکەی پێکردووە: ﴿ يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ ﴾[2] وە فەرمانی خواشی لەسەرە: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾[3]

❖ وە هەندێك ئەڵێن: ئارامگرتن واتە خاوەنی نارەحەتی ئەگەر لەناو کۆمەڵێکدا بوو ئەبێ لێیان جیانەکرێتەوە واتە پێوەی دیارنەبێت.

## ئایەتە قورئانییەکان لەسەر ئارامگرتن:

[1] مدارج السالكين إبن قيم ج٢ ص١٥٢.
[2] سورة لقمان/ آية ١٧.
[3] سورة آل عمران/ آية ٢٠٠.

زانای بەرز ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (خوای لـێ رازی بێـت) ئەفـەرموێت: (خوای گەورە لە قورئاندا باسی ئارامگرتنی کردووە لە ٩٠ شوێندا).

وە ئێستاش هەندێك شوێن لەو ئایەتانە باس دەکەین:

١ـ بەشێوەی فەرمان بە پشتبەستن بەخوا لەکاتی ئارامگرتندا ﴿ وَاصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِاللَّهِ ﴾[٤].

٢ـ نەکردنی پێچەوانەیەتی واتە لەکاتی ئارامگرتندا دڵگران و خەفـەتبار مەبن ﴿ وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا ﴾[٥].

٣ـ رزگاربوون و سەرکەوتنی پەیوەستکردووە بەئەنجامی ئارامگرتنەوە وەك دەفـــەرموێت ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾[٦].

٤ـ پاداشتی دووجارە بۆ ئارامگرتن ﴿ أُولَئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا ﴾[٧].

٥ـ ئەنجامی ئارامگرتن و پتەوبوون لەسەری ئەبێت بە پێشەوای (امامە)ی چـاکە بـۆ خـەڵکی ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ﴾[٨].

٦ـ خوای گەورە لەگەڵ ئارامگراندایە، بەدەستهێنانی لەگەڵ بوونی خـوادا ﴿ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴾[٩].

---

[٤] سورة النحل/ آية ١٢٧.
[٥] سورة آل عمران/ آية ١٣٩.
[٦] سورة آل عمران/ آية ٢٠٠.
[٧] سورة القصص/ آية ٥٤.
[٨] سورة سجدة/ آية ٢٤.
[٩] سورة البقرة/ آية ١٥٣.

٧ـ سێ پلەی بەرز ئەنجامی ئارامگرانە: چاودێری خوا، بەزەیی، رێنمـویی ﴿ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ، الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ، أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ ﴾[١٠].

٨ـ خوای گەورە ئارامگرتنی کردووە بەپاڵپشت بـۆ بـاوەڕداران ﴿ اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ ﴾[١١].

٩ـ وە ئارامگرتن و خواپەرستی ئەنجامی سەرکەوتنی موسوڵمانانە: ﴿ بَلَى إِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُمْ مِنْ فَوْرِهِمْ هَذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُمْ بِخَمْسَةِ آلَافٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴾[١٢].

١٠ـ ئارامگرتن باوەڕدار دەپارێزێت لەهەموو فڕوفێڵێکـی دوژمـن ﴿ وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا ﴾[١٣].

١١ـ لەپاداشتی ئارامگرتنـدا خـوا بەهەشـتتان پـێ دەبەخشـێت وە فریشتەکان سڵاوتان لێدەکـەن ﴿ وَالْمَلَائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِمْ مِنْ كُلِّ بَابٍ (٢٣) سَلَامٌ عَلَيْكُمْ بِمَا صَبَرْتُمْ ﴾[١٤].

١٢ـ وە پاداشتیان لێخۆشبوون و پلـەی بـەرزە ﴿ إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَئِكَ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴾[١٥].

١٣ـ خوای گەورە ئارامگرتنی بەجوانترین ڕەوشت داوەتـە قەڵـەم ﴿ وَلَمَنْ صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ ﴾[١٦].

١٤ـ خوای گەورە مرۆڤی ئارامی خۆش دەوێت ﴿ وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ ﴾[١٧].

---

[١٠] سورة البقرة/ آية ١٥٥.
[١١] سورة البقرة/ آية ١٥٣.
[١٢] سورة آل عمران/ آية ١٢٥.
[١٣] سورة آل عمران/ آية ١٢٠.
[١٤] سورة الرعد/ آية ٢٣ ـ ٢٤.
[١٥] سورة هود/ آية ١١.
[١٦] سورة الشورى/ آية٤٣.

١٥ـ ئارامگرەکان زۆر سوودو پەند لەفەرمانەکانی خوا وەردەگرن ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآَيَاتِنَا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَذَكِّرْهُمْ بِأَيَّامِ اللَّهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآَيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾[١٨].

١٦ـ ئارامگرتن تەواوکەری فەرمانەکانی ئیسلامە وە ئەڵقەیەکی نەپچڕاوە لێیان، وەك پەیوەندی بەنوێژەوە بەستووە ﴿ وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ ﴾[١٩]. وە بەکردەوەی باشەوە ﴿ إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ﴾[٢٠]. وە بەخواپەرستییەوە ﴿ إِنَّهُ مَنْ يَتَّقِ وَيَصْبِرْ ﴾[٢١]. وە بەسوپاس و ستایشەوە ﴿ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآَيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾[٢٢]. وە پەیوەندی بەراستی و دادپەروەرییەوە ﴿ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ ﴾[٢٣]. وە دەفەرموێت ﴿ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ ﴾[٢٤]. وە بەدامەزراندن و پتەوبوونی باوەڕەوە ﴿ لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآَيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴾[٢٥]. وە بەراستگۆیی ﴿ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ ﴾[٢٦].

## فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئارامگرتن:

وە ئێستاش هەندێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئارامگرتن باس دەکەین:

---

[١٧] سورة آل عمران/ آية ١٤٦.
[١٨] سورة إبراهيم/ آية ٥.
[١٩] سورة البقرة/ آية ٤٥.
[٢٠] سورة هود/ آية ١١.
[٢١] سورة يوسف/ آية ٩٠.
[٢٢] سورة إبراهيم/ آية ٥.
[٢٣] سورة العصر/ آية٣.
[٢٤] سورة البلد/ آية ١٧.
[٢٥] سورة السجدة/ آية ٢٤.
[٢٦] سورة الأحزاب/ آية ٣٥.

❖ پێغەمبەر (ﷺ) بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕبوو کە دەگریا لەسەر گۆڕی کوڕەکەی، پێی فەرموو: ئارام بگرە و خوا بپەرستە. ئافرەتەکە وتی: تۆ نازانی چیم بەسەردا هاتووە! (ئافرەتەکە پێغەمبەر نەناسی). کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) تێپەڕبوو پیاوێك پێی وت: ئەوە پێغەمبەر بوو قسەی لەگەڵ کردی! ئافرەتەکە لەتاودا وەك مردووی لێهات هەڵسا بەپەلە چوو بەدوایدا، تا پێی گەیی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نەمناسیت (واتە گوێڕایەڵیت دەکەم). پێغەمبەر فەرمووی: ئارامگرتن لەیەکەم کاتتدایە، (واتە لەکاتی تازە مردنیدا)[27].

❖ دایکی موسڵمانان (أم سلمة) خوا لێی رازی بێت ئەڵێت کە پێغەمبەر فەرموویەتی: (هەر موسڵمانێك بەڵایەکی بەسەردا هات ئەو ئایەتە بڵێت کە خوا فەرمانی پێداوە ﴿ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴾ ئەوا خوا شوێنی بە خێرو چاکە بۆ پڕدەکاتەوە)[28]. وە هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت (ئەگەر خۆشەویستێکم لەبەندەیەکم سەندەوە و ئارامی گرت ئەوە پاداشتی بەهەشتە)[29].

❖ وە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) چەند پارەو موڵکێکی بەش دەکرد بەسەر موسوڵماناندا کەسێك وتی: ئەم شێوە بەشکردنە ویستی خوای تیادا نییە. کاتێك ئەمەیان بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە فەرمووی: (خوا لەموسا خۆش بێت لەم شێوەیە زیاتر ئازاریان ئەداو ئارامی گرت)[30].

---

[27] الصحيحين مسلم والبخاري (١٣٨/٣) ومسلم (٦٢٦).

[28] صحيح مسلم (٩١٨) وأبوداود (٣١١٩).

[29] في صحيح البخاري.

[30] في الصحيحين.

❖ وه پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (هەرکارێك تووشی موسڵمان بێت لەخەمو خەفەت و بەڵاو ئازار، هەتا دڕکێکیش بچێت بەلاشەیدا خوا تاوان و هەڵەی پێ لا ئەبات)[31].

❖ وه لەگێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: (خوای گەورە هەر پلەیەك بەرزی دەکاتەوەو تاوانێکی پێ لادەبات). (رواه مسلم)

❖ پیاوێك پرسیاری کرد و وتی: ئەی پێغەمبەر ئایا ئەم نەخۆشیانەی ئێمە تووشمان دێت هیچ پاداشتمان هەیە؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لابردنی تاوانە).[32]

❖ وەهەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (هەربەڵایەك رووی کردە بەندەیەك و پێی ناخۆش بوو ئەوە دەبێتە هۆی پاك بوونەوەی لەتاوان بەمەرجێك باوەڕی بەوە بێت کە ئەو بەڵایە لەلایەنی خواوەیە وە پەناوهاوار نەبات بێجگە لەخوا شیفای بدات)[33].

❖ پێغەمبەر (ﷺ) دارێکی راوەشاند گەڵاکانی وەرین، فەرمووی: (بەڵاو ئێش و ئازار تاوانەکانی ئادەمیزاد لادەبات زووتر لەم شێوە گەڵا وەرینەی ئەم دارە)[34].

❖ وه پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (نزاو پاڕانەوەی نەخۆش ناگەڕێتەوە هەتا چاك دەبێتەوە)[35]. واتە: نەخۆش کەوتن کاتێکە لەو کاتانەی نزای تێدا وەردەگیرێت.

---

[31] في الصحيحين رواه البخاري (٥٦٤١) ومسلم (٢٥٧٣).
[32] السنن الكبرى النسائي، مسند إمام أحمد (٢٣/٣).
[33] سەرچاوەی پێشوو.
[34] سنن النسائي.

❖ وه پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هەر فەرمانێك خوا بیدا بەسەر بەندەیەكیدا هەر بەخێرو چاكە بۆی دەنوسرێت، ئەگەر فەرمانەكەی خوا تووشی خێری كردووە سوپاسی خوای لەسەر كرد ئەوا خواش بەخێر بۆی ئەنوسێت وە ئەگەر زیانو نارەحەتی بوو وە ئارامی لەسەرگرت ئەوە خوایش بەخێرو چاكە بۆی دەنوسێت ئەمە بۆ هیچ كەس نییە ئەگەر موسڵمان نەبێت)[36].

## وتەی یاوەرانی پێغەمبەر (ﷺ) و زانایان:

❖ عومەری كوڕی خەتاب خوا لێی رازی بێت ئەفەرموێت: (سەبرو ئارامگرتن خۆشترینژیانی بۆ رەخساندووین).

❖ عەلی كوڕی ئەبی تاڵیب خوا لێی رازی بێت ئەفەرموێت: (ئارامگرتن لەئیماندا وەك سەر وایە لەلاشەدا وەهیچ كەس ئیمانی تەواو نییە ئەگەر ئارام نەگرێت).

❖ عومەری كوڕی عەبدولعەزیز خوا لێی رازی بێت دەفەرموێت: (هەر نیعمەتێك خوا لەبەندەكەی وەرگرتەوە ئارامگرتنی پێدەبەخشێت لەشوێنی ئەو نیعمەتە) وە ئارامگرتنیش نیعمەتێكی خوایە، هەندێك لە سەلەف فەرموویانە: ﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ﴾[37] مانای ئەوەیە بەئارامگرتنێك ناڕەزایی تێدا نەبێت.

---

[35] سنن النسائي ومسند إمام أحمد.
[36] رواه مسلم وأحمد.
[37] سورة يوسف/ آية ١٨.

❖ سەعیدی کوڕی جوبەیر خوا لێی رازی بێت دەفەرموێت: (ئارامگرتن داننانی ئادەمیزادە بەخواو داوای پاداشتە لێی) وەك واتای ﴿ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴾ی کردبێت، دانـدەنێت بـەوەی خـوای گـەورە خـاوەنی هـەموو بوونەوەرێکە خۆی هەڵیدەسوڕێنێت ﴿ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴾ ئێمەش ئەیگێڕینەوە بۆ لای، واتە ئەڵێین بەویستی خواو تاوەکو پاداشتمان بداتەوە.

❖ پرسیاریان کرد لە خواناسێك تەواوی ئارامگرتن چۆنە؟ وتـی: (ئـەبێ ئەو رۆژەی بەڵاکەی بەسەردا هاتووە وەك دوێنێ وابێت کە بەڵاکەی بەسـەردا نەهاتووە).

## ئارامگرتن و جیاوازی پلەکانی:

ئارامگرتن بەگوێرەی پلەو پاداشت لای خوای گەورە دوو جۆرە:

١ـ ئارامگرتنی هەڵبژاردەیی (إختياري).

٢ـ ئارامگرتنی بێدەستەڵات (إضطراري).

ئارامگرتنێك بەویستو رەزامەندی و هەڵبژاردنی خۆت بێت پلە بەرزترەو مایەی هەموو پاداشـت و رێزێکـە لای پـەروەردگار، واتـە لەبـەر پاداشـت و رەزامەندی خوا پێت خۆشە ئەو ناخۆشیانەت بەسەردابێت تاوەکو ئارامگرتنێك کە هیچ دەسەڵاتێکی خۆتی تێدا نییە و لەپڕ بێت بەسەرتا و بێ ئاگابیت لێـی ئیتر بەناچاری ئارامی لەسەر بگریت.

نموونـە: هـەروەك ئـارامگرتنی یوسـف (علیـه السـلام) لەسـەر فێڵـی ئافرەتەکان و زینـدانی لەسـەری ﴿ قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ

﴾[38] . ئەمەیان پلە بەرزترە وە خوای گەورە بە وەسف ناوی دەبات تاوەکو جۆری دووەم کە بەبێ دەستەڵات ئارامی لەسەرگرت هەروەك ئارام گرتنەکەی لەسەر فێڵی براکانی و خستنە ناو بیروفرۆشتنی بەشێوەی بەندە، لەبەرئەوە ئارامگرتنی (إختیاری) دوو بەشە لەسێ بەشەکەی ئارامگرتن کە ئەویش (١ـ أمر ، ٢ـ نهی)یە، وە هەروەها وەکو پێغەمبەران (ئیبراهیم و موسا و نوح و عیسا) علیهم السلام ئارامیان گرت لەسەر ئەو هەموو دژایەتییە کەبەسەریاندا هات لەپێناوی (توحید)دا، بۆیە ناوبراون بە (ألوا العزم) خاوەنی هەڵوێست و ئارامی لەسەر دژایەتی کردنەکان بەرەزامەندی خۆیان بووە، بۆیە خوای گەورە فەرمان ئەدات بە محمد (ﷺ) کە وەك ئەو پێغەمبەرانە هەڵوێستی ئارامی رەزامەندیت هەبێت ﴿ فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُو الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ ﴾[39] ، ئەمانە هەموویان ئارامگرتنیان هەڵبژارد بۆیە فەرمان دەدات بە (خۆشەویستی) کە وەکو ئەوان وابێت نەك وەکو ئەوانەی لەناچاریدا ئارامیان گرت لەبەرئەوەی پلەی کەمترە ﴿ فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُنْ كَصَاحِبِ الْحُوتِ إِذْ نَادَى وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴾[40] لەبەرئەوەی یونس علیه السلام ئارامگرتنی (إختیاری) نەبوو بەڵکو ئارامگرتنی ناچاری هەبوو (إضطراری)، بەڵکو بەشی دووەمیش بێ بەش نییە لەپاداشت هەروەك لەدوای ئەوەوە دەفەرموێت ﴿ فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ ﴾[41] هەروەك (ئەیوب علیه

[38] سورة يوسف/ آية ٣٣.
[39] سورة الأحقاف/ آية ٣٥.
[40] سورة القلم/ آية ٤٨.
[41] سورة الأنبياء/ آية ٨٧.

السلام) هەمان ئارامگرتنی هەبوو ﴿ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴾[٤٢].

وە هەروەها (یەعقوب عليه السلام) بەهەمان شێوە دەفەرموێت ﴿ إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ ﴾[٤٣] کەواتە ئارامگرتنێکی ناچاری (إضطراری) بێبەش نییە لەپاداشت، وە لەرەزامەندی خوا، بەڵکو یەکەمیان کە خاوەنەکەی بەرەزامەندی خۆی هەڵیدەبژێرێت پتەوتر و مایەی رەزامەندی و پلە بەرزترە لای خوای گەورە واتە هەردوو جۆرەکەی ئارامگرتن پاداشت و پلەبەرز و ناوبراون لای خوای گەورە هەروەك قورئان هەردوولایان باس دەکات وە (حکمەت) لە ئارامگرتندا گەڕانەوەیە بۆ لای خوای خۆتو داوای یارمەتی لێکردنە و لاوازی و بەندایەتی دەربڕینەوە وەك دەفەرموێت ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَاهُمْ بِالْعَذَابِ فَمَا اسْتَكَانُوا لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ﴾[٤٤].

## ئەو هۆیانەی یارمەتی دەدەن لەسەر ئارامگرتن:

ئارامگرتن کارێکی بەدەستهێنانە (إکتساب)ییە، بۆیە بۆبەدەستهێنانی ئەو کارە پێویستیت بەهەندێك روونکردنەوەو پێشەکی هەیە وەکو هۆکارێك بۆ یارمەتیدانی ئەو کارە، وە ئێستاش ژمارەی هەندێك لەو هۆیانە باس دەکەین:

١ـ زانیاری و ئاگاداربوون بەسەر سروشتی ژیاندا کە دەبێت بەرز و نزمی تێدا بێت وەکو (جوان و ناشیرین و دەوڵەمەندی و هەژاری و خۆشی و ناخۆشی و زانین و نەزانین و ...هتد) لەبەرئەوەی ژیان بەبێ ئەمانە پێکنایەت وە ئەبێت

[٤٢] سورة الأنبياء/ آية ٨٣.
[٤٣] سورة يوسف/ آية ٨٦.
[٤٤] سورة المؤمنون/ آية ٧٦.

(هەمووی بەسەریا بێت ئەوەی لەسەری نووسرابێت (جفت القلم بما أنت لاقيه) کە ئەمەتزانی ئەبێتە مایەی بچووکبوونەوە و سروشتی کارەکە.

٢ـ دروستبوونی باوەڕی تەواو بەپاداشتی ئەو ناخۆشییە تاوەکو تاڵی ناخۆشییەکەت لا کەم ببێتەوە وە هەروەك نەخۆشێك چۆن پێی خۆشە و رازییە ئەو دەرمانە تاڵە بخوات لەبەر زۆری سوودەکەی ﴿ وَلَنَجْزِيَنَّ الَّذِينَ صَبَرُوا أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾[٤٥] پاداشتیان بەباشتر لە کردەوەکانیان دەدرێتەوە.

٣ـ دروستبوونی باوەڕی تەواو بەوەی کە بەهەتایی بەسەریەوە نابێت بەڵکو پاش ماوەیەك لادەچێت ﴿ إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ﴾[٤٦]، ﴿ فَاصْبِرْ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴾[٤٧].

٤ـ پەنا بردنە بەر پەروەردگاری خۆت کە یارمەتیت بدات لەسەر ئارامگرتن و باشترین یارمەتی دەرە بۆ ئارامگرتن ﴿ وَاصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِاللَّهِ ﴾ ، ﴿ رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا ﴾[٤٨]، ئەمەش بە دوعا و زیکر دەبێت لەکاتی ناخۆشیەکەدا، لەکاتی نەبوونی بەڵادا نەیلێت چونکە دەبێتە داواکردنی بەڵا.

٥ـ بۆ یارمەتیدانت لەسەر ئارامگرتن چاو لەکارو پاشەڕۆژی ئارامگران بکە ﴿ فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُو الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ ﴾ هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) باسی موسڵمانانی زووی دەکرد بۆ یاوەرەکانی لەمەککەدا تاوەکو ئارامگر و بەهێزتربن و نەڕوخێن و پشت نەدەنەوە.

[٤٥] سورة النحل/ آية ٩٦.
[٤٦] سورة شرح/ آية٥.
[٤٧] سورة هود/ آية ٤٩.
[٤٨] سورة البقرة/ آية ٢٥٠.

٦ـ یارمەتیدانێکی تر باوەڕبوونە بەوەی کە بەهۆی کارە خراپەکانەوە خوای گەورە ناخۆشی بەسەر ئادەمیزاددا دەدات زۆرکات. ﴿ وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ ﴾[49]، ﴿ ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ ﴾[50]، لەبەرئەوەی باش وایە پەنابەرینە بەر داوای لێخۆشبوون و گەڕانەوە لەتاوانەکان و وشەی داوای لێخۆشبوون (أستغفر الله) لەسەر زمانمان بێت.

٧ـ یارمەتییەکی تر سەیرکردنی ئەوانەی لەخوار خۆتەوەن لەڕوانگەی ژیان یاخود لاشە یا سامان یا...هتد، کە تۆ هێشتا زۆر باشتریت لەهەموو لایەنێك لەوانەوە تاوەکو ناخۆشییەکەت ئاسان بێت وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (.. أنظروا الى من هو أسفل منكم..)[51].

٨ـ کەمکردنەوەو دوورکەوتنەوە لەوشتانەی ئەبێتە هۆی کاری ئارام نەگرتن لەسەر ئەو کارە وەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمان دەدات بەو گەنجانەی کە ناتوانن خێزان بهێنن بەرۆژوو بن وەکو یارمەتییەك لەسەر گەنجیەتی.. خۆڕاگرتن.

٩ـ خۆپاراستن لە بزوێنەری داواکارییەکان کە سەیرکردنە (النظر) وەك دەگێڕنەوە (النظر سهم مسموم من سهام إبليس)[52]، سەیرکردن تیرێکە لە تیرە ژەهراوییەکانی شەیتان. چاوگرتن واتە قەڵای پاراستن. (ماناکەی تەواوە بەڵام پلەکەی (ضعيف)ە و (إبن قيم) باسی پلەکەی نەکردووە.

---

[49] سورة شورى/ آية ٣٠.
[50] سورة روم/ آية ٤١.
[51] رواه البخاري ومسلم، وفي البخاري رقم (٦٤٧).
[52] السلسل الضعيفة الألباني رقم (١٠٦٥).

١٠ـ پاراوکردن و تێرکردنی دەروون لە حەڵاڵەکان وەکو بەدیل و گۆڕانکاری لەحەرامەکاندا لەبەرئەوەی هەرچییەك دەروونی ئادەمیزاد داوای بکات لەحەرام حەڵاڵی لەبەردەمدا هەیە.

١١ـ بیرکردنەوە لەزیانو خراپی حەرام وە تاوانەکەی لەژیانی دونیادا بەسە بۆ دوورکەوتنەوە لەتاوانەکە ئەگەر بێتو بەهەشت و دۆزەخیش نەبێت بەڵام چاوی ئارەزوو کوێرە، وەك ئەبوبەکرو عوسمان (خوایان لێ رازی بێت)ە نە ئارەقیان خواردووتەوە و نە زیناشیان کردووە لەبەر زیان و ناشیرینی کارەکە لە ئەقڵیەتی پاکدا.

١٢ـ بیرکردنەوە وە لەشێوازو وێنە راستەقینەی کارەکە کە هەموو دەروونێکی پاكو بەرز نەفرەتی لێدەکات و نایەوێت، وەك شاعیر دەڵێت:

إذا كثر الذباب على طعام		رفعت يدي ونفسي تشتهيه
وتجتنب الأسود ورود ماء		إذا كاك الكلاب يلغن فيه

ئەگەر مێش زۆر بوو لەسەر خواردنێك دەستی لەسەر هەڵدەبڕمو دەروونم داوای دەکات. شێر دوور دەکەوێتەوە لە گۆماوێك کە سەگ ئاوی لێبخوات.

١٣ـ بەهێزکردنی لایەنە دینییەکە: واتە یارمەتییەك بۆ درووکەوتنەوە لەتاوان پیاچوونەوەیەکی کارەکە بکات لەسەر روانگەی دینەکەی تاوەکو بزانێت تا چ رادەیەك لێی دوور بکەوێتەوە، وە شێوازی پیاچوونەوەکان ئەمانەن:

أ) شەرمکردن لەخوای گەورە کە تاوان بکات وە فەرمانەکانی بشکێنێت لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە ئەبیسێت و ئەبینێت کارەکەی بە

(حقیقی) واتە فەرمانی یەكێك ئەشكێنیّ كە سەیرت ئەكات و چاودێرە بەسەرتەوە ئەمە مایەی هەموو شەرمێكە.

ب) نەكردنی كارێك خوا پێی خۆشە ئەو كارە نەكەیت تۆ پشت هەڵدەكەیت لەخۆشەویستی خوا لەگەڵ ئەوەشدا تۆ خۆشەویستی و خواناسی خوا دەردەبڕیت. وەكو ئیمامی شافیعی دەفەرمویّت: (لە دیوانەكەیدا لە لاپەڕە ٥٨دا):

تعصي الإله وأنت تظهر حبه		هذا محال في القياس بديع
لو كان حبك صادقا لأطعته		إن المحب لمن يحب مطيع

تاوان ئەكەیت و خۆشەویستی خوا دەردەبڕیت ئەمە كارێكی نابەجێیە لە عەقڵ. ئەگەر خۆشەویستییەكەت راست بوایە گوێڕایەڵیت دەكردوە خۆشەویست گوێڕایەڵیّ خۆشەویستییەتی.

ج) سەیری نیعمەت و بەخشندەكانی خوا بە بەسەرتەوە ئایا یەكێك چاكەت لەگەڵدا بكات شایستەیە پێچەوانەی ویستەكانی بجوڵێتەوە، كەواتە پاداشتی چاكە هەر چاكەیە ﴿ هَلْ جَزَاءُ الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ ﴾[53].

د) چاوەڕێكردن و ترساندن لە ئەنجامی كارە خراپەكانت كە هەمووی مایەی توڕەبوون و تۆڵەسەندنەوەی پەروەردگارە لێت. كەواتە لە توڕەو سزای خوای خۆت خۆت بپارێزە ﴿ وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ ﴾[54]، ﴿ اتَّقُوا رَبَّكُمُ ﴾[55].

هـ) ناوو نازناوی ناشیرین لێیان ئەنجامی كارە خراپەكان بەسە بۆ ئەوەی دووربكەوێتەوە لە تاوان، لەبری ناوو نازناوی شیرین، وەك (متقي و مؤمن و

[53] سورة الرحمن/ آية ٦٠.
[54] سورة آل عمران/ آية ٢٨.
[55] سورة النساء/ آية ١.

محسن) گۆڕان بۆ (السارق و الفاجر و العاصي و الظالم) له ئایندا وه ناوی چاك بۆ كەسێك چاك دەبێت.

و) لەگەڵ نەبوونی پەروەدگار لەگەڵ ئەوكەسانەی تاوان دەكەن بەسەر بۆ خراپی ئەنجامی كاری تاوان ﴿ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴾ ﴿ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوْا وَالَّذِينَ هُمْ مُحْسِنُونَ ﴾[56].

سەرپەرشتی و پاراستنی تایبەتی بۆ كەسانی باوەڕدارو چاكەكاران، داماوی بۆ ئەو كەسەی كە خوای گەورە سەرپەرشتی ناكات و لەگەڵیدا نییە لەكارەكانیدا وە دەیداتەوە دەست دەروونی خۆی.

وە (إبن القیم) خوا لێی رازی بێت چۆنیەتی ئارامگرتن دەكات بە سێ بەشەوە لەبواری خواپەرستی و تەوحیددا (١ـ الصبر بالله ، ٢ـ الصبر لله ، ٣ـ الصبر مع الله)[57].

١) ئارامگرتن بەخوای گەورە: واتە پشتبەستن بەخوا لەسەر ئارامگرتن ئەمە پەیوەندی بە (توحید الربوبیه)ەوە هەیە. (الصبر بالله).

٢) ئارامگرتن لەبەر خوا: ئەوەیە ئارامبگریت لەبەر رەزامەندی خوا ئەمە پەیوەندی بە (توحید الألوهیة)ەوە هەیە. (الصبر لله).

٣) ئارامگرتن لەگەڵ خوادا: واتە گەڕانی بەندەیەك لەگەڵ مەبەستەكانی دینی خوادا (الإرادة الدینیة) وە ئارامگرتن بۆ بەجێهێنانی فەرمانی خوا بەهەموو شێوەیەك، بەڵام لەهەموویان بەهێزتر ئارامگرتنە لەبەر خوا كە هەمووی دەبێتە مایەی خواپەرستی، بەڵام یەكەم داواكاریەو یارمەتییە وە

---

[56] سورة النحل/ آية ١٢٨.

[57] مدارج السالكين ج٢ ص ١٥٢.

سێیەم تواناو ڕەزامەندی تۆی تێدا نییە، بەڵام دووەم ڕەزامەندی و تواناو داوای تۆی تێدایە بۆیە لە هەردوو بەشەکە لەبەرزترە. (الصبر مع الله).

کەواتە با هەموو ئارامگرتنێکمان بچێتەوە سەر خاڵی دووەم کە لەبەر خوای پەروەردگار بێت مایەی ڕەزامەندی ئەومان مەبەست بێت.. کە پەیوەندی بە (توحيد الألوهية)ەوە هەیە.

## هەندێك لە ئارامی پێغەمبەر (ﷺ) و یاوەرانی:

ڕوونو ئاشکرایە کە چاکترین سەدەیەك کە ئادەمیزادی تیا ژیابێت سەدەی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵانی بووە لەبەرئەوە هەموو فەرمانەکانی خواو پێغەمبەریان تێدا بەڕێوەبردووە، هەر لە بچووکەوە هەتا گەورە لەهەموو ساتێك و کاتێکدا لەبەرئەوە نمونایەتی بەڕێوەبردنی یاساو فەرمانەکانی ئیسلامیان دەکرد لەسەر زەوی.

وە ئێستاش چەند کاتو ژیانێکیان باس دەکەین کە هەریەکێکیان شاخێکی پۆڵایین بوون بەرامبەر هەموو ئەو کاتە دڵتەزێن و سامناکانەی کە تووشیان بووە لەژیانی ڕۆژانەیاندا.

❖ وەك عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێ: چوومە لای پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی نەخۆشییەکەیدا تایەکی زۆر توند و تیژی هەبوو، وتم: ئەی پێغەمبەر تایەکی زۆرت هەیە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ بەئەندازەی دووانی وەك ئێوە تام هەیە. وتم: دوو پاداشتت هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە هەر مووسڵمانێك لەسەر زەویدا.. وە هەر ئێش و ئازارو نەخۆشییەکی تووش

بێت خوای گەورە تاوانەکانی پێ لادەبات وەك چۆن گەڵا بەدارەوە دەوەرێت.[٥٨]

❖ وە دایکی موسوڵمانان عائیشە خوا لێی رازی بێت دەفەرمویت: هیچ ئێشوئازارێکی توندم نەبینوە وەك ئێش‌وئازارەکەی پێغەمبەر (ﷺ)[٥٩].

❖ ئوسامەی کوڕی زەید خوا لێی رازی بێت دەفەرمویت: یەکێك لە کچەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بەدوای پێغەمبەردا کە پێی بڵێن منداڵێکم خەریکە دەمرێت!! پێغەمبەر فەرمووی: سڵاوی منی پێبگەیەنن بڵێن: خوای گەورە بەدەستی خۆیەتی ئەوەی کە دەیبەخشێت وە هەموو کارێك لای خوا تا کاتی دیاریکراوی خۆیەتی، با ئارام بگرێت تا پاداشتی بداتەوە. بەڵام کچەکەی پێغەمبەر دووەمجار ناردیەوە بەدوایدا.. پێغەمبەر (ﷺ) هەستا لەگەڵ سەعدی کوڕی عەبادەو موعازی کوڕی جەبەل و ئوبەیی و زەیددا چوون بۆ ماڵی کچەکەی لەوێ منداڵەکەی گرتە باوەشی و منداڵەکە هەر دەتلایەوە لەباوەشیدا، پێغەمبەر (ﷺ) فرمێسك بەچاویدا هاتە خوارەوە. سەعد وتی: ئەمە چییە ئەی پێغەمبەر؟ (واتە بۆچی دەگریت) لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانت داوە بە نەگریان لەسەر مردوو؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەمە بەزەییە کە خوا دەیخاتە دڵی ئەو بەندانەی کە دەیەوێت، وە خوا بەزەیی دێتەوە بەو بەندانەی کە بەزەییان لە دڵدایە[٦٠].

❖ وە ئێستاش ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی رازی بێت بەسەرهاتێکی ترمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرمویت (بینیم ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر

---

[٥٨] رواه البخاري ومسلم.
[٥٩] رواه البخاري ومسلم.
[٦٠] صحيح سنن النسائي ـ الألباني ـ باب الجنائز ، والبخاري (١٠٢/٣) ، ومسلم (٩٣/٣).

(ﷺ) تەپاوتلی دەدا لەباوەشی پێغەمبەردا خەریك بوو گیانی دەردەچوو، چاوەکانی پێغەمبەر پڕبووبوون لە فرمێسك و بەچاویدا دەهاتە خوارەوە فەرمووی: چاو فرمێسك دەڕێژێت و دڵ بریندار و نارەحەت دەبێت و هیچ ناڵێین تەنها ئەوە نەبێت کە خوا پێی خۆش نەبێت سوێند بەخوا ئەی ئیبراهیم ئێمە بە دووری تۆ دڵتەنگ و خەفەتبارین[٦١].

❖ وە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود خوا لێی ڕازی بێت زۆر نەخۆش بوو هەندێك لە هاوەڵانی چوون بۆ سەردانی بینیان زۆر ناساغە وتی: دەمێکە کەوتووم لەجێگادا و لەشم وشك بۆتەوە سوێند بەخوا حەز ناکەم خوا بەئەندازەی سەرەنینۆکێك ئەم نەخۆشیەم لێ کەمبکاتەوە[٦٢].

❖ وە ئەبوبەکری سدیق خوا لێی ڕازی بێت ناساغ بوو یاوەرەکان صەحابە چوون بۆ لای پێیان وت با پزیشکێکت بۆ بانگ بکەین. وتی: پزیشك منی بینیوە. وتیان: ئەی چی پێ وتی؟ فەرمووی: پێی وتم (إني فعال لما أريد) ـ لە ئایەتی ﴿ فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ ﴾[٦٣] ئەوەی بمەوێت دەیکەم ـ.

❖ هەروەك عوروەی کوڕی زوبێر لەگەڵ کوڕەکەیدا موحەمەد چوون بۆ لای خەلیفە وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك)، محەمەدی کوڕی عوروە سیمایەکی جوانی هەبوو بەلاشەو هەیکەل بوو جلێکی جوانی لەبەرکردبوو، کاتێك وەلید ئەم کوڕەی بینی وتی: کوڕانی قوڕەیش جاران ئاوابوون. لەدوای ئەم قسەیە هاتنە دەرەوەو کوڕەکەی بەچاوییەوە بوو تاکو مردووە قاچی عوروەیش باوکی تووشی خۆرە بوو. وتیان: ئەگەر نەیبڕیتەوە ئەیداتە هەموو

[٦١] سلسلة الصحيحة ـ الألباني حاشية رقم ٤٢٧، أخرجة البخاري (١٣٥/٣) ومسلم.
[٦٢] عدة الصابرين ص٨٩.
[٦٣] سورة البروج/ آية ١٦.

لەشت. ئەویش وتی: بیبڕنەوە. وتیان: شتێکت نەدەینێ تا هەست نەکەیت بە ئازار. وتی: نەخێر بەڵکو خـوا ئەمــەی داوە بەســەرما تــا بیبینێــت رادەی ئارامگرتنم. کاتێك مشاریان خستە سەرقاچی دەســتیان کـرد بەبڕینــەوە و بورایەوە.. دوای هاتەوە سەرخۆی و قاچەکەی کە بڕیانەوە هەڵیگرتو وتی: ئەی قاچەکە من تا ئێستا سوێند بەخوا بەتۆوە نەچووم بۆ هیچ حەرامێك و تاوانێك تەنانەت بۆ ئەوەی کە خـوا پێــی ناخۆشــە. دوای ئــەوە فەرمانیــدا بنێــژرێت، لــەدوای ئەمانــە گەڕایــەوە بــۆ شــاری مەدینــە هــەر خــۆی.. خزموکەسوکارەکانی ئەهاتن بۆ لای سەرخۆشیان لێئــەکرد ئــەویش وتــی: ﴿ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَاهُ آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا ﴾[٦٤].

❖ پێغەمبەر (ﷺ) زۆر هیلاك بوو لەو نەخۆشییەدا کە کۆچــی دوایــی کرد فاتمەی کچی هاتە ژوورەوە بۆ لایی و گریا بەدەنگی بەرز و وتــی: ئــای چەندە باوکم لەهیلاکییەکی زۆر دایە! پێغەمبەر (ﷺ) فــەرمووی: لــەمڕۆ بەدواوە لە هیلاکیدا نامێنم.[٦٥] دوای ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد ناشتیان، فاتمە چووە ئەو ژوورەی کە پێغەمبــەریان تیــا ناشــت و رووی کردە ئەنەس و وتی: چۆن دڵتان رێگە دەدات خۆڵ بکەن بەسەر پێغەمبــەری خوادا؟! ئەنەس وتی: سوێند بەخوا بەدەست ئەیکــەینو دڵمــان دژایــەتیمان دەکات، ئەو کاتە فاتمە خوا لێی رازی بێت چــنگێك خــۆڵی لەســەر گــۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) هەڵگرت و ئەم شیعرەی وت:

ماذا على من شم تربة أحمد ألا يشم مدى الزمان غواليا

[٦٤] سورة الكهف/ آية ٦٢.
[٦٥] البخاري (١١٣/٨) وأحمد (١٩٧/٣).

صبت علي المصائب لو أنها صبت على الأيام عدن لياليا

ئەبێت حاڵی ئەو کەسە چی بێت کە تا ئێستا بۆنی خۆڵی سەرگۆڕی پێغەمبەری (ﷺ) بەسەردا نەهاتووە. بەڵایەك بەسەر مندا رژاوە ئەگەر بێتو بەسەر رۆژاندا بڕژایە ئەبوو بەشەو[٦٦].

❖ کاتێك ئەبو دەرداء نەخۆش کەوت هاوەڵەکانی چوون بۆ لای بۆماڵەوە وتیان: چ نەخۆشیەکت هەیە؟ وتی: نەخۆشی تاوان و گوناهمە (واتە ئەمەوێت بەم نەخۆشییە تاوانەکانم لابچێت)، وە وتیان حەز لەچی دەکەیت؟ وتی: حەز لە بەهەشت دەکەم. وتیان: ئەی پزیشکت بۆ بانگ نەکەین؟ وتی: ئەو منی خستووە لە جێگەدا. بەو شێوەیە هاوەڵەکان هەموو دەم حەزیان کردووە ئەوەی کە خوا پێی خۆشە تووشیان بێت.

❖ هەروەك زەیدی کوڕی ئەرقەم خوا لێی رازی بێت ئەڵێت: چاوم ئازار و ئێشێکی زۆری ئەکرد نەخۆش کەوتم بەدەستیەوە، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ لام فەرمووی: ئەی زەید ئەگەر هەرچاوت دابێت چی دەکەیت؟ وتم: ئارام دەگرم و چاوەڕێی پاداشت دەبم لای خوا، فەرمووی: ئەگەر چاوت هەروابێت و ئارام بگریت پاداشتت بەهەشتە.

❖ کاتێك زەید و جەعفەرو عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە، شەهیدکران پێغەمبەر (ﷺ) دەستی بەرزکردەوە و داوای لێخۆش بوونی بۆ ئەکردن فرمێسك بەهەر دوو چاویدا ئەهاتە خوارەوە دوای ئەوە چوو بۆ ماڵی هەریەك لەوانە کاتێك چووە ماڵی زەیدی کوڕی حاریسە کچە بچکۆلەکەی

---

[٦٦] صحيح البخاري.

بــەقورگی پــڕ لەگریانــەوە خــۆی خســتە باوەشــی پێغەمبــەر (ﷺ) وە پێغەمبەریش دڵی پڕ بوو گریا[٦٧].

❖ ئوسامەی کوڕی زەید خوا لێی رازی بێت دەفەرموێت: کاتێـك بـاوکم شەهید بوو لەشەڕی مۆتە چووم بۆ لای پێغەمبەر، کە منی بینی فرمێسك بەچاویدا هاتە خوارەوە.

❖ هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر خوا لێـی رازی بێـت لەجـەنگی تائیفدا تیرێکی بەرکەوت شەهید بوو، ئەمە بە چل رۆژ دوای کۆچی دوایـی پێغەمبەر (ﷺ) روویدا، ئەبوبەکری سدیق دوای ئەوە چوو بۆ لای عائیشە و وتی: ئەی کچم سوێند بەخوا هەروەك گوێی مەڕێك بگرم و لەماڵ بیبەمە دەرێ (دیارە عائیشە خەفەتی ئەخوارد) وە وتی: ئەی کچـم ئێـوە ئەترسـن عەبدوڵڵام بەزیندوویی خستبێتە گۆڕ، ئەویش وتی: ئەی باوکە ﴿ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴾. کاتێك نوێنەری (**ثقيف**) هاتن بۆ لای خەلیفـە ئەبوبـەکری سدیق ئەویش چوو ئەو تیرەی عەبدوڵڵای کوڕی پێ شەهید کرابوو هێنـای و وتی: خاوەنی ئەم تیرە ئەناسنەوە کێیە؟! دوای تێڕوانین یەکێکیان وتی: ئـەم تیرە بەدەستی من دروستکراوە و هاوێژراوە لەشەڕدا. ئەبوبـەکر خـوا لێـی رازی بێت فەرمووی: ئەم تیرە بـوو عەبـدوڵڵای کـوڕی ئەبوبـەکری کوشـت سوپاس بۆ خوا کەلەسەر دەستی تۆدا شـەهید بـوو وە بەدەسـتی ئـەو تـۆ نەکوژرای لەسەر بێباوەڕی تا روورەش بیت لای خوا[٦٨].

---

[٦٧] حياه الصحابه ج٣ ص١٦٩ ، صحيح النسائى ـ الألبانى ـ البخارى (١٣٩/٣) ومسلم (٧٠/١).
[٦٨] حياة الصحابة ج (يوسف كاندهلوي)٣/ص١٧٤ أخرجه الحاكم ج٣/ ص٤٧٧.

❖ هەروەها رۆژێك بە ئەبوزەریان وت: تۆ هیچ مندالّت بۆ نامێنیت (وەك کەموکورییەك دایانە پالّی) ئەویش وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایە لەدونیا لێمدەستێنێت و لەرۆژی دوایی بۆم کۆدەکاتەوە.

❖ وە هەروەها کاتێك حەمزە خوا لێی رازی بێت شەهید کرا، مامی پێغەمبەر (ﷺ) لەجەنگی ئوحوددا پێغەمبەر (ﷺ) چووە سەری و بینی لەشیان پارچە پارچە کردووە بەشێوەی (هەتککردن) پێغەمبەری خوا (ﷺ) مامی بینی بەم شێوەیە ئارامی گرتوو بینی ئافرەتێك بەرەو رووی شەهیدەکان رادەکات فەرمووی: ئەو ئافرەتە.. ئەو ئافرەتە. پێی ناخۆش بوو بەو شێوەیە بیانبینێت. زوبەیری کوڕی عەوام وتی: زانیم ئەو ئافرەتە دایکمە (صفیه)یە وە پوری پێغەمبەر (ﷺ) بوو بەرەو رووی رامکرد و پالّم پێوەنا نەمدەهێشت ئەویش هەر هەولّی ئەداتە بچێتە مەیدانی جەنگەوە تا وتم: ئەی دایکە پێغەمبەر فەرمانی داوە نەهێلّین و بتگێڕینەوە، ئینجا وەستاو دوو پارچە قوماشی دەرکردوو وتی: دەباشە بەم دوو پارچە کفنی حەمزەی برام بکەن بیستوومە کە شەهید کراوە بەلاّم ئارام دەگرم[٦٩].

❖ عەبدوللاّی کوڕی مەسعود کاتێك کە بیستی بەکۆچی دوایی عوتبەی برای فرمێسك بەچاویدا هاتە خوارەوە و پێیان وت: ئەوە ئەگریت؟ ئەویش وتی: ئەوە بەزەییەکە خوا خستوویەتییە دلّی بەندەکانیەوە وە ئادەمیزاد هیچ تواناو دەسەلاّتی بەسەردا نییەو وە عوتبە لەگەلّ ئەوەشدا برام بوو هاوڕێی

[٦٩] حیاة الصحابة ج٣ ص١١٧٥ أخرجه الحاكم ج٣ ص١٩٧ و رواه أحمد ١٤١٨ سنده حسن والبيهقي ٤٠١٣ صحيح.

ئیسلامم بوو حەزم دەکرد من لەپێش ئەودا بمرم تـا ئـەو ئـارامی بگرتایـە پاداشتی بدرایەتەوە لەسەر من.

❖ وە دایکی موسوڵمانان زەینەبی کچی جەحش کاتێ کۆچی دوایی کرد برایەکی کوێری هـەبوو پێیـان وت: بـاوکی ئەحمـەد سـەرینەکەی زەینـەبی خوشکی گرتبووە باوەش و ئەگریا، عومەری کوڕی خەتاب خـوا لێـی رازی بێـت فـەرمووی: ئـەی بـاوکی ئەحمـەد سـەرینەکە دابنـێ هـیچ سـودت پێناگەیەنێت. وتی: ئەی عومەر ئەمە تەسکینیم پێدەگەیەنێت و گـەرمایی دڵم سارد دەکاتەوە. عومەر فەرمووی: بیگرە.. بیگرە.

❖ کاتێ عومەری کوڕی خەتاب بریندار کرا پـێش ئـەوەی کـۆچ بکـات فەرمووی: ئەگەر مردم نانو خواردن بۆ ئەو خەڵکە ئامادە بکەن و بـەڕێیان کەن. لەدوای ئەوەی وەفاتی کرد و ناشتیان و گەڕانەوە بۆ ماڵـەوە خـواردن ئامادەکراو هاوەڵـەکان هـەموویان دانیشـتن بـەڵام هیچیـان بـۆ نـەدەخورا لەخەفەتدا، عەباسی مامی پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ئـەی خەڵکینـە پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد لەدوای ئەو خواردمان و خواردمانەوە وە ئەبوبەکر کۆچی دوایی کرد لەدوای ئەویش دەستمان کـردەوە بـە خـواردن و خواردنەوە ئەبێت هەر بخۆین. ئیتر عەباس دەستی راکێشا بۆ خواردنەکـە و موسوڵمانانیش دەستیان راکێشا.

❖ وەعەلی کوڕی ئەبوتاڵیب خوا لێی رازی بێت سەرخۆشی لە ئەشعەسی کوڕی قەیس کرد کە کوڕەکەی مرد بوو فەرمووی: ئەم قـەدەرەت بەسـەردا هاتووە ئەگەر ئارام بگریت خوا پاداشتت دەداتەوە، وە ئەگەر ئارام نەگریت و

بگریت و هاوار بکەیت ئەوا تاوان بارئەبیت و لەگەڵ ئەوەشدا کە هەر هاتووە بەسەرتدا و ناگەڕێتەوە.

❖ ڕۆژێك ئیمامی عومەر خوا لێی ڕازی بێت و چەند هاوەڵێکی مردوویەکیان ئەبرد بۆ گۆڕستان.. لایەکی نەعلەکەی پێی ئیمامی عومەر پچڕا ئەویش فەرمووی ﴿ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴾. وتیان: ئەی خەلیفە ئەوەت وت بۆ پچڕاندنی نەعلێك؟! فەرمووی: بەڵێ هەرشتێك موسوڵمان تووشی بێت و پێی ناخۆش بێت ئەوە بەڵایە (**مصيبة**) وە لەکاتی بەڵادا ئەبێت ئەوە بوترێت. بەم شێوەیە ئارامی هاوەڵەکان شاخێکی پۆڵایین بوون بەرامبەر بای تاریکی خەم و خەفەت، نەك هەر پیاوان بەڵکو ئافرەتانیش بەهەمان شێوە بوون وەك لەمەوپێش هەندێکمان باس کرد وە ئێستاش هەندێکی تر لەئارامیان باس دەکەین.

❖ عەبدوڵڵای کوڕی عەباس خوا لێی ڕازی بێت بە (**عطاء**)ی وت: ئەتەوێت ئافرەتێکی بەهەشتیت پیشان بدەم؟ دەستی بۆ ئافرەتێکی ڕەش ڕاکێشاو وتی: ئەو ئافرەتە ڕەشەیە، هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: من ئەبورێمەوەو خۆم رووت دەکەمەوە (نەخۆشی پەرکەمی هەبوو) بۆم بپاڕێرەوە لای خوا لەسەرم لابدات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر ئارام بگریت ئەوە پاداشتت بەهەشتە، وە ئەگەر دەتەوێت داوا دەکەم لەخوا لەسەرت لابدات؟! ئافرەتەکە وتی: ئارام دەگرم قەیناکا بەڵام دوعام بۆ بکە خۆم رووت نەکەمەوە. پێغەمبەریش (ﷺ) دوعای بۆ کرد وە لەدوای ئەو دوعایە خۆی

رووت نەدەکردەوە [٧٠]. بوخاری ئەفەرمویت (عطـاء) وتی: ئەو ئافرەتە رەشە دایکی ئیمامی زوفەر بوو کە قوتابی ئەبوحەنیفە بووە.

❖ هەروەها لە جەنگی بەدردا حارسی کوڕی سوراقە تیرێکـی بەرکـەوت شەهید بوو لەدوای جەنگەکە دایکی هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)و وتـی: ئەی پێغەمبەر هەواڵم بدەرێ حارسەی کوڕم ئەگەر لەبەهەشتدایە بـا ئـارام بگرم و پێی دڵخـۆش بم وە ئەگـەر لـە بەهەشـتیش نییـە بادەسـت بکـەم بەخۆکوشتن و گریان (هێشتا لەم کاتـەدا خۆکوشـتن لەسـەر مـردوو حـەرام نەبووبوو). پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا تێکچوویت؟ خۆ یەك بەهەشت نییە چەندەها بەهەشتە کوڕەکەی تۆ لەبەرزترین پلەی بەهەشتە (فیردەوس). دایکی کە ئەمەی بیست وتـی: ئـارام دەگـرم وە بەپێکەنینـەوە لەخۆشـیدا گەڕایەوە.[٧١]

❖ وە کاتێك عوسمانی کوڕی مضـعون کۆچـی دوایـی کـرد پێغەمبـەر (ﷺ) ناوچاوی ماچ کرد و فرمێسك بەچاوەکانیدا دەهاتە خـوارەوە تـاوای لێهات ئەکەوتە سەر روومەتی عوسمان.[٧٢]

❖ ئێستە لەگەڵ بەسەرهاتی ئافرەتێکی باوەڕدار کە ناوی دایکی سـەلیم بوو رۆژێك هاتەوە بۆ لای مێردەکەی کە موسڵمان نەبوو بوو هەموو جارێك هـەواڵێکی بـۆ ئـەهێنا، رۆژێـك هاتـەوە وتـی: هـەواڵێکم بـۆ هێنـاوی. مێردەکەشی وتی: هەموو جارێك هەواڵێکی ناسازم بۆ دەهێنیتەوە لای ئەو کابرایە (مەبەستی پێغەمبەر بوو) دوایی وتی: دەیبزانم هەواڵی چیت پێیە؟!

[٧٠] حياة الصحابة ج٣ ص١٨٠ رواه البخاري ومسلم.
[٧١] حياة الصحابة ج٣ ص١٧٠ أخرجه الشيخان عن أنس.
[٧٢] أخرجه الترمذي وصححه ١٣٠/٢ ومجمع الزوائد ٢٠/٣.

دایکی سەلیم وتی: عەرەق حەرام بووە. مێردەکەشی وتی: ئائەمە جیاوازییە لەنێوان من و تۆداو مرد بەبێ باوەڕی.. دوای ماوەیەك ئەبوتەڵحە چوو بۆ داوای شووی پێبکات، دایکی سەلیم وتی: من چۆن شوو دەکەم بەتۆ کە تۆ پیاوێکی بێ بڕوای وە تەختەیەك دەپەرستی کە بەندەکەم پیسایی لادەکات. (ئەبو تەڵحە) وتی: نەخێر مەبەستت ئەوە نییە (واتە مەبەستت موسوڵمان نەبوونی من نییە). ئەویش وتی: ئەی مەبەستم چییە؟ وتی: مەبەستت ئاڵتوون و زیوە. دایکی سەلیم وتی: تۆ گەواهی بدە لەگەڵ پێغەمبەردا ئەگەر موسڵمان بیت شووت پێدەکەم وە مارەییەکەم موسوڵمان بوونت بێت. وتی: ئەی چۆن بچم بۆلای پێغەمبەر؟ ئەڵێت کاتێك نزیك بووینەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لە قسەکانمان بوو فەرمووی: ئەوە ئەبوتەڵحەیە لەنێوان هەردوو چاویدا موسوڵمان بوونی تیا دیارە. گەیشتە لای پێغەمبەر (ﷺ)و سلاوی کردو وتی باوەڕم هەیە کە هیچ خوایەك نییە بێجگە لە (اللّٰه) وە موحەمەدیش بەندەو نێراوی خوایە. موسڵمان بوو وە پێغەمبەر دایکی سەلیمی لێ مارە کرد لەسەر ئیسلام بوونی وە منداڵێکیان بۆ زۆری خۆش دەویست ئاواتی زۆری پێبوو. مناڵەکە نەخۆش کەوت (ئەبوتەڵحە)ش چوو بوو بۆ سەفەر کاتێك گەڕایەوە منداڵەکە مرد، دایکی سەلیم هەستا منداڵەکەی لەسووچێکی ماڵەکەدا دانا سەری داپۆشی. کاتێك ئەبوتەڵحە گەڕایەوە دایکی سەلیم پێی وت: ئەمڕۆ خواردنت دواکەوت یان خواردنت بۆ بێنم. ئەویش پرسیاری منداڵەکەی کرد وتی: چۆنە؟! دایکی سەلیم وتی: ئێستا بێدەنگ بووە بەڵکو بحەسێتەوە. نانی خوارد و شەو داهات و بەجوانترین شێوە خۆی بۆ رازاندەوە ئەوسا هەواڵی دایەو پێی وت: ئەی

ئەبوتەڵحە ئەگەر یەکێك شتێکی بە ئەمانەت هێناو ماوەیەك لات بوو دوای ئەوە خاوەنەکەی بردییەوە ئایا پێویست دەکات دڵگران بیت و پێت نـاخۆش بێت؟ وتی: نەخێر. دوای ئەوە وتی: کوڕەکەت خوا بردییەوە بۆ لای خـۆی و مردووە. پرسیاری لێکرد: لەکوێیە؟ وتی: ئەوەتا لەو سوچەدا داپۆشـیوە. کاتێکی بینی مردووە وتی: (إنا لله وإنا إليه راجعون). دوای ئەوە چوو بۆ مزگەوت و دوای نوێژی بەیانی هەواڵی دا بە پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەویش فەرمووی: خوا بەرەکەت بخاتە ئەم شەوەتانەوە. لەدوای ئەمە خوا منداڵێکی پێ بەخشین. ئەنەس ئەم هەواڵەی گەیاند بە پێغەمبەر (ﷺ) وە فەرمووی: ئەی ئەنەس بڕۆ بۆلای دایکت پێـی بڵـێ خوابەرەکـەتی تێبخـات وە ببێـت بەخواناسێکی خێرومەند وە پێی بڵێ هیچی لێنـەکات هـەتا دێـم ئـەویش ناوکی بڕی و داینا هەتا پێغەمبەر هات، کاتێك پێغەمبـەر هـات خسـتیە باوەشی و فەرمووی هیچی لەگەڵ دایە وتی: بەڵێ چەند خورمایەکی لەگـەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەنکێ لە خورماکانی دەرکردو وە کردیە دەمی منداڵەکە و دەمی شیرین کردو منداڵەکەش دەمی دەجوڵاند بـەدوای شـیرینییەکەدا. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەنصاری (واتە خەڵکی مەدینە) حەز لەخورما دەکەن دوای ئەمە ناوی نا (عبدالله) وە (سفیان) دەڵێت: لەنەوەی ئەم کوڕە نۆ کوڕم بینی هەموویان قورئانیان ئەخوێنـد دوعاکـەی پێغەمبـەر (ﷺ) هاتە دی بۆیـان نەوەیـەکی زۆرو هـەموویان بـاوەڕدارو خوانـاس ئەمـەش بەبۆنەی ئارامگرتنی دایکی سەلیمەوە[٧٣].

[٧٣] رواه البخاري ج٢ ص٨٢٢ ومسلم ٤٠/٣ وأحكام الجنائز ـ الألباني ص٢٦.

❖ کاتێـك نەخۆشـی تـاعون بڵاوبـوەوە لەشـام ئەبوعوبەیـدە وتـارێکی پێشکەش کردو وتی: ئەی خەڵکینە ئەم نەخۆشـییە رەحمەتێکـە بۆمـان وە دوعای پێغەمبەرە (واتـە داوای کـردووە نەخۆشـیمان تـووش ببێـت تـاکو لەتاوانـەکانمان پـاك ببینـەوە) وە مردنـی پیاوچـاکانە لـەپێش ئێـوەدا وە ئەبوعوبەیدەیش داوا دەکات ئەم نەخۆشییە بەشـی ئەبوعوبەیـدە تیـا بێـت دوای ئەمە تووشی بوو کۆچی دوایی کرد دوای ئەمە مەعاز بوو بەپێشەوای موسوڵمانان بەهەمان شێوە وتـاری پێشـکەش کـردو وتـی: خوایـە بەشـی مەعازی تیابێت لەدوای ئەمە دوو کچی تـاعون لێـی دان و مـردن دەسـت بەجێ دوای ئەمە کوڕەکەی عبدالرحمن تووشی هەمان نەخۆشی بـوو کاتـێ مەعاز لە مزگەوت گەڕایەوە وتی: ئەی عبدالرحمن چۆنی؟ وتی: ئەی باوکـە ﴿ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ ﴾[٧٤] لایەنی خوایەو دڵگـران مـەبن مەبەستی بەمە بوو. وە باوکی وتـی: ﴿ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ ﴾[٧٥] وە بەئیزنی خوا ئێمەش ئارام دەگرین ئەو شەوە عبدالرحمن کۆچی دوایی کرد بەتاعون و بەیانی ناشتیان دوای ئـەوە مـەعاز داوای کـرد لـەخوا کـە خۆیشی تووشی بێت، تاعون دای لە دەستی هەموو جـار سـەیری ئـەکردو ئەیوت ئەمەم لەهەموو شـتێك بـەلاوە خۆشەویسـترە یـەکێك لای مـەعاز ئەگریا پرسیاری لێکرد بۆ ئەگریت وتی: لەبەرئەوە ئەگریم تۆ بمریت زانست و زانیاری یەکی زۆرت لەگەڵ دەڕوات وتی: ئەگەر من مردم بڕۆن بۆ لای چوار کەس بۆ زانست و زانیاری (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ، عەبدوڵڵای کـوڕی

---

[٧٤] سورة البقرة/ آية ١٤٧.
[٧٥] سورة الصافات/ آية ١٠٢.

سـەلام ، سـەلمان فارسـی ، ئـەبو دەرداو) دوای ماوەیـەك وەفـاتی کـرد بەنەخۆشی تاعون[٧٦] ، هەزاران هەزار درودو سلاو لە گیانی پاکی بەرزی بێت و جێگەی فیردەوسی بەریت بێت اللهم آمین.

## چۆنیەتی ئارامگرتن لەکاتی بەلادا و گریان لەسەر مردوو:

گریان لەسەر مردوو پێغەمبـەر (ﷺ) قەدەغـەی نـەکردووە بەمـەرجێك قژرنینـەوەو هـاوارکردن و لاواندنـەوەی تێـدا نـەبێت کـە ئەمانـە هـەمووی پێغەمبەری خوا بەکردەوەی سـەردەمی نـەفامی (جاهلیـة) نـاوی بـردووە وە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك دوور کەوێتەوە لەو کردەوانەی کە تاوانبار دەبێت لەسەری و بەتایبەتی گریان لەسەر مردوو کە مردووەکەیش ئازاری پـێ ئەچێژێت بەوبۆنەیوە وە ئێستاش بەچەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم باسە شیتەڵ دەکەینەوە:

❖ وەك جابری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێی رازی بێت دەفـەرموێت: کاتێـك باوکم شەهید بوو لەجەنگی ئوحددا من گریام هاوەڵەکان پێیان ئەوتم مەگریە بەلام پێغەمبەر هیچی نەدەفـەرموو وە پـورە فاتیمـەم دەگریـا پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: بگرین و نەگرین بەردەوام فریشتەکان بەباڵیان سێبەری بۆ دەکەن هەتا بەرزی دەکەنەوە.[٧٧]

❖ عـەبدوڵلای کوڕی عومەر خوا لێی رازی بێت ئەڵێت: سـەعدی کـوڕی عەبادە ناساغ بوو لەماڵـەوە پێغەمبـەرو عەبـدولرەحمانی کـوڕی عـەوف و

[٧٦] حیاة الصحابة (یوسف کاندهلوي) ج٣ ص١٧٠.
[٧٧] أخرجه الشیخان والنسائي وأحمد ٢٩٨/٣ ـ أحکام الجنائز ـ الألباني ص٢٠.

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود کاتێ چوونە ژوورەوە بۆ لای بینیان بوراوەتەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کۆچی کردووە؟ وتیان: نەخێر، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەوشێوە بینی دەستی کردە گریان و هاوەڵەکان بینیان پێغەمبەر گریا ئەوانیش گریان. وە فەرمووی: ئەی نەتانبیستووە کە خوا بەفرمێسکی چاو و خەفەتی دڵ کەس ئازارو سزا نادات وە دەستی راکێشا بۆ زمانی و فەرمووی بەڵام بەمە ئازاری ئەدات لەبەرئەوە لاواندنەوەو هاوارکردن و قیژاندن هەر بەزمان دەکرێت[٧٨].

❖ وە لەو کاتەدا روقیەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد ئافرەتەکانی چواردەوری ئەگریان وە عومەری کوڕی خەتابیش بێدەنگی ئەکردن. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی وازیان لێبێنە ئەی عومەر بابگرین بەڵام ئاگایان لەخۆیان بێت نەقیژێنن و هاوار نەکەن وەك هاواری شەیتان.[٧٩] هەروەك لەشوێنێکی تردا دەفەرموێت: گریان هەتا بە فرمێسك و بە خەفەتی دڵ بێت ئەوە لەلایەن خواوەیە وە لەبەزەیی و رەحمەوەیە وە ئەگەر لەلایەن دەست و زمانەوە بێت لەلایەنی شەیتانەوەیە. واتە ئەگەر گریان دووربێت لە قژرنینەوە و خۆڵ کردن بەسەرداو قیژاندن و هاوارکردن و یەخەدادڕین ئەوە تاوانبار نابێت لەسەری وە ئەگەر بەپێچەوانەوەی ئەمانەوە بوو ئەوا تاوانبار دەبێت وە هەر ئەمانەیشە بەدەست و زمان دەکرێت.

❖ هەروەها لە مردنی ئیبراهیمدا بە پێغەمبەریان فەرموو ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ فەرمانت نەداوە کە نەگرین؟ پێغەمبەر (ﷺ)

---

[٧٨] في الصحيحين، وسلسلة الصحيحة رقم ٤٢٧.

[٧٩]. مسند الإمام أحمد.

فەرمووی: نەخێر بەڵکو فەرمانم داوە بە نەکردنی دەمو چاوڕنینەوە و یەخەدادڕین و هاوارکردن[٨٠].

وەلەم بارەیەوە ئێستاش چەند رووداوێك باس دەکەین کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تیایاندا گریاوە:

❖ وەك لە ساڵی ٨ی کۆچیدا کاتێ مەککەیان گرتەوە و چووە سەر گۆڕی دایکی و گریا.

❖ وە هەر لەوساڵەدا گریا لەسەر زەینەبی کچی کاتێ کۆچی دوایی کرد.

❖ وە رهە لەو ساڵەدا کاتێك زەیدو جەعفەرو عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە شەهیدبوون دەستی بەرزکردەوە بۆیان و یەکەیەکە ناوی دەبردن و دوعای خێری بۆ دەکردن و فرمێسك بەچاویدا ئەهاتە خوارەوە. رەواه مسلم ١/٧٠.

❖ هەروەها گریا بۆ مردنی سەعدی کوڕی مەعاز خوا لێی رازی بێت لەساڵی پێنجەمی کۆچیدا.

❖ وەکاتێك چووە سەر عوسمانی کوڕی **مضعون** بینی کۆچی کردووە ناوچاوی ماچ کرد و فرمێسك بەچاویا ئەهاتە خوارەوە ئەوەندە گریا هەتا فرمێسکەکان ئەکەوتنە سەر روومەتی عوسمان[٨١].

❖ ئەبوبەکری سدیق گریا لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کۆچی دوایی کرد[٨٢].

---

[٨٠] جامع الترمذي عن جابر بن عبدالله وصحيح النسائي للألباني وسلسلة الصحيحة رقم ٤٢٧

[٨١] صحيح الأرواء ٦٣٩ عن عائشة ، وإبن ماجة ١١٩١.

[٨٢] صحيح النسائي ـ الألباني ـ باب الجنائز.

❖ وەك كۆمەڵێ ژن ئـەگریان و عومـەری کـوڕی خـەتاب نەیدەهێشـت بگرین، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: وازیان لێبێنە ئەی عومەر نەفس تووش بووە و چاو فرمێسك دەڕێژێت و تازە مردووەکەیان لێمردووە.[83]

❖ وەگریان بەدەنگی بەرز و هەڵـدان بەسـەر مـردوودا مردووەکـە سـزا دەدرێت لەگۆڕدا وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: لە ئێمە نییە هەرکەسێك رووی داڕنێت و یەخە دابدڕێت و هەڵدات بەسـەر مـردوودا وەك سـەردەمی نەفامی[84].

❖ هاوەڵێکی پێغەمبەر (ﷺ) کەناوی ئەبوموسای ئەشعەری بوو جارێك نەخۆش بوو، بورایەوە ئافرەتێکیش لەوکاتـەدا قیژانـدی ئـەویش سـەرەتای بورانەوەکەی بوو نەیتوانی نەیەڵێت دوای ئەوەی کە هۆشی هاتەوە وتی: من بەریم لەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی بێ بەرییە پێغەمبـەر (ﷺ) بەریە لەقیژاندن و قژڕنینەوە و یەخەدادڕین[85].

وە ئەم کردەوانە هەمووی بەس لە ئافرەت ئەوەشێنەوەو کردەوەی ئافرەتـە بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێـك ئافرەتـەکان هـاتن پـەیمانیان لێـوەرگرتن فەرمانیدا: پەیمان بدەن کە بت نەپەرستن و هاوەڵ بۆ خوا دانەنێن و زینا نەکـەن و دزی نەکەن و لەسەر مردوو شین و گریـان و لـەخۆدان نەکـەن. یـەکێك لـەو کۆمەڵە ئافرەتەی پەیمانیدا بە پێغەمبـەر (ﷺ) نـاوی (أم عطيـة) بـوو کـە دەڵێت یەکێك لەو پەیمانانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی وەرگـرتین ئـەوە

[83] مسند الإمام أحمد عن ابي هريرة وضعيف سنن النسائي الألباني ١٨٥٩، وإبن ماجة ١٥٨٧ ضعيف.
[84] البخاري ١٢٧/٣ ، ومسلم ٧٠/١.
[85] البخاري ١٢٩/٣ ، ومسلم ٧٠/١ ، أحكام الجنائز ص٣٠.

بوو: نابێت شین و گریان لەسەر مردوو بکەین وە لە هەموو ئەو کۆمەڵە ئافرەتە پەیمانەکەیان نەبردە سەر بێجگە لە پێنج ئافرەت نەبێت[٨٦].

❖ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێی رازی بێت ئەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: مردوو بەگریان لەسەری ئازار دەچێژێت لەگۆڕدا[٨٧].

❖ هەروەك عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە جارێك ناساغ بوو بورایەوە خوشکەکەشی بەدەنگی بەرز ئەگریا و ئەی لاواندەوە هەرجارێ بەشێوەو وەسفێك کاتێ هۆشی هاتەوەسەرخۆی عەبدوڵڵا بەخوشکەکەی وت: هەرچییەك وەسفت دەکردم و ئەتلاواندمەوە یەکەیەکە پێیان ئەوتم.. تۆ ئەوەی.. تۆ ئەوەی.. ئیتر ئەو خوشکەی وازی لەو کردەوەی هێنا تەنانەت عەبدوڵڵاش شەهید بوو لە جەنگی (مؤتة) نەگریا.[٨٨] بەلام ئەگەر چەند وشەیەك بەکاربهێنن و بیڵێن لەکاتی مردنی کەسێکی خزمیدا کە دوور بێت لەوەسفو ریایی دونیاوە وە مەبەستی نارەزایی دەربڕین و لاواندنەوە نەبێت لەناوخەڵکیدا ئەوە رێگەی دراوە و تاوانبار نابێت بە ئیزنی خوا..

❖ پێش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی بکات چەند جارێك ئەبورایەوە، فاتمە هاتە ژوورەوەو وتی: هاوار باوکم چەند لەئیش‌وئازاردایە پێغەمبەر فەرمووی: لەمڕۆ بەدواوە باوکت لەئێش و ئازاردا نابێت[٨٩]. دوای

---

[٨٦] صحيح البخاري ١٣٧/٣ ومسلم ٤٦/٣ ـ أحكام الجنائز ص٢٨.
[٨٧] رواه البخاري ومسلم وإبن ماجة في صحيحه وأحكام الجنائز الألباني ص٢٨.
[٨٨] رواه البخاري والبيهقي ٦٤/٤ أحكام الجنائز الألباني ص٢٩.
[٨٩] البخاري ١١٣/٨.

ئەوە پێغەمبەر کۆچی دوایی کرد.. فاتمە وتی: ئەی باوکە خوا داواکەی لێوەرگرتیت[→] . ئەی باوکە بەهەشتی فیردەوس جێگاتە و جوبرەئیل هاوەڵتە.

❖ وەکاتێ ئەبوبەکر خوا لێی رازی بێت چووە سەر پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوای کردبوو نێوان هەردوو چاوی ماچکرد و وتی: ئەی هاوار بۆ پێغەمبەری خوا بۆ هاوڕێی خۆشەویست بۆ هەڵبژاردەی خوا[٩٠].

❖ ئەم وشانەی کە باسمانکرد هیچی نارەزایی دەربڕین و هەڵەی تێدا نەبوو لەبەرئەوەی هەمووی وەسفی راستی و چۆنیەتی مردووەکەی تێدا بوو. بەوشێوە باسی کرد کە هەموو کەس زانیویەتی و هەستی پێکردووە هەروەك کاتێك ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر مرد فەرمووی: ئەی ئیبراهیم بەبۆنەی دوورکەوتنەوەی تۆوە خەفەتبارو دڵگرانین[٩١].

## بەڵام ئێستاش بابێینە سەر سزای گۆڕی مردووەکە:

❖ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر[→] خوا لێی رازی بێت ئەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: مردوو ئازار دەدرێت بەگریانی زیندوو لەسەری[٩٢] هەربەم شێوەیە بەپێنج هاوەڵ ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە. عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی رازی بێت و عەبدوڵڵای کوڕی موغیرەی کوڕی شەعبەو عەمرانی

---

[→] مەبەستی ئەوە بوو کە پێغەمبەر فەرمووی لەمڕۆ بەدواوە لەئێش و ئازاردا نامێنمەوە وادیارە بۆ سبەینێ ئەو رۆژە کۆچی دوایی کردووە.

[٩٠] البخاري ٨٩/٣ والنسائي ٢٦٠/١ وإبن ماجة في صحيحه ٢١٥٥.

[٩١] سلسلة الصحيحة رقم ٤٢٧.

[→] مەبەستی ئیمامی عومەر و کوڕەکەیەتی.

[٩٢] سنن النسائي ١٧/٤.

کوڕی حەصین و ئەبوموسای ئەشعەری بەڵام کاتێك هاوەڵـەکان ئەمـەیان بـۆ عائیشەی خێزانی پێغەمبەر گێڕایەوە، دژایەتی کردوو وتی ئەوە نییە خـوای گەورە دەفەرمویێت ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى ﴾ هیچ کەس تاوانی کەسـی بـۆ ناچێت بەڵام ئێوە لەیەکێکەوە ئەگێڕنەوە نەدرۆزنن نەناوبراون و بەخراپە بەڵام بیستن هەڵە دەکات (واتە رەنگـە بەهەڵـە تێگەیشـتبن)... بـەڵام پێغەمبـەر (ﷺ) جارێك تێپەڕ بوو بەسەر گۆڕێکی جولەکەدا فـەرمووی خـاوەنی ئـەم گۆڕە لەسزادایە و کەس و کاریشی بۆی دەگرین.

❖ عائیشە دەیگێڕێتەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی خوا ئازاری بـێ بڕوا زیاد دەکات لەگۆڕدا کاتێك خزمو کەسوکاری لەسەری ئەگرین[٩٣].

بەڵام ئەو دوو ریوایەتەی نێوان عومەری کوڕی خەتاب و چـوار هاوەڵـەکان لەگەڵ عائیشە خێزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زانـای بـەرزی ئیسـلام (إبـن تیمیـة) دەڵێت هەموو موسڵمانێك ئەگەر زانی کـاتی مـردن شـین ئەکـەن و ئەگرین لەسەری پێویستە ئامۆژگاریان بکاتو وەسیەت بکـات کـە نـەگرین لەسەری وە وەسیەتی نەکرد کە نەگرین لەسەری ئەوە رەزامەنـدە پێـی وەکـو ئەوە وایە کە خراپە ببینێتو فەرمان بەلابردنی نەکات لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە توانای بەسەریدا بشکێت وەکو ئەم چۆن تاوانبار دەبێت ئەویش ئاوا تاوانبـار دەبێت، واتـە وەکـو کـردەوەی خـۆی لێـدێت و سـزا دەدرێـت لەسـەر ئـەو کردەوەیەی، بەم شێوەیە لەگەڵ ئایەتەکەدا دەگونجێت.

[٩٣] رواه البخاري ومسلم.

هیچ کەس لەبەر کـردەوەی کـەس ئـازار نادرێـت وەك عائیشـە دژایـەتی گێڕانەوەی حەدیسەکەی عومەری کوڕی خەتاب دەکات، وەهیچ دوور نییە کە هەندێك شـت دووربـووە لـە عائیشـەوە نەیبیسـتووە لـە پێغەمبـەر (ﷺ) لەبەرئەوەی ئامادە نەبووە لەوکاتەدا وە شتێکی روون و ئاشکرایە کە هەڵە و لەبیرچوونەوە دەربارەی عومەری کوڕی خەتابو ئـەو چـوار هاوەڵـە گەورانـە شتێکی زۆر دوورونادروستە، وە رای زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەیە کە ئەگەر وەسیەت بکات بەگریان لەسەری ئەوکاتـە تاوانبـار ئـەبێت و سـزای لەسـەر ئەدرێت، بەڵام وەسیەت بکات کە نەیکەن یاخود نارازی بێـت ئـەو تاوانبـار نابێت لەسەری.[٩٤]

هەروەك عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك ئەفەرموێت: ئەگەر لە ژیانـدا فـەرمان بەنەکردنی بکات وە لە دوای خۆی ئەو کارانەیان کرد ئەوە بە تاوان نانوسرێت لەسەری[٩٥].

## ئارامگرتن و سوپاس و ستایشکردنی خودا :

ئایا خوای گەورە کامیانت پێ ببەخشێت لە (ئـارامگرتن یـان سـوپاس و ستایشکردنی خودا لەکاتی هەژاریدا وە یاخود لـەکاتی دەوڵەمەندیـدا تـاوەکو جێگەی رەزامەندی خوا بێت لەدونیا و قیامەتدا.. وە یاخود کامیـان دەبێتـە هۆی پلە.) بەرزی ئادەمیزاد لای پەروەردگاری هەموو جیهان تا لەسزای ئـاگر دوورەپەرێز بێت و بەبەهەشتی بەرین شاد بێت.

---

[٩٤] أحكام الجنائز ـ ألألباني ص٢٩.
[٩٥] عمدة القارئ شرح صحيح البخاري ٤/٧٩.

مامۆستا (أبي فرج الجوزی) لـەم وتویـژەدا سـێ رای زانایـان بـاس دەکات:

یەکەم/ ئارامگرتن (الصبر) باشترە.

دووەم/ سوپاس‌و ستایشی کردنی خوا (الشکر) باشترە.

سێیەم/ هەردووکیان.

بەڵام تەواوی کاری باوەڕوو (ئیمان) هەردووکیانن وەك عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسعود دەفەرموێت: باوەڕ دوونیوەن نیوەی ئارامگرتنە وە نیوەی سوپاسگوزرایە) هەروەك خوای گەورە لەسورەتەکانی (إبراهیم ، شوری ، سبأ ، لقمان) هەردووکیانی کۆ کردۆتـەوە وە ئەفـەرموێت ﴿ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآَيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾..

عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی رازی بێت فەرموویەتی: ئەگەر ئارامگرتن وشترێك بێت و سوپاسکردنی خوا وشترێك بێت سورای هـەرکامیان بـبم وەکـو یەکە بەلامەوە. واتە هەردووکیان مایەی سەربەرزی موسوڵمانان بۆ لای خـوا!! ئەگەر زمـانێکی پـاراوی شـوکرانەت پـێ ببەخشـێت‌و ئـارامێکی زۆرت پـێ ببەخشێت لەسەر هەژاری‌و دەوڵەمەندی یاخود کاتێ خۆشی و بەڵا‌و ناخۆشی.. وە ئێستەش بۆ روونکردنەوەی باسەکە هەریەك لەو دووانە بەبەڵگەی قورئـان و فەرموودەکان باس دەکەین تـا شـارەزابین بەسـەر هـەردوولادا. ئەمانـەی کـە ئارامگرتن بە پلە بەرزترین دادەنێن تاوەکو سوپاسگوزاری، ئەڵێن:

خوای گەورە لەزۆر شوێنی قورئاندا وەسفی باسی ئارامی کردووە بەچەندەها شێوەو پەیوەندی بەستووە بەهەموو کردارەکانی خێرو چاکەوە جا لەقورئاندا باسی کردووە هەرجارەی بەشێوازی پلە و باسێکەوە، وەك دەفەرموێت ﴿ وَلَنَجْزِيَنَّ الَّذِينَ صَبَرُوا أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾[٩٦]. وە خواپەرستی ﴿ وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ.. ﴾[٩٧]، وەخوا هەموو سامانو ئالتونی بەخشی بەپێغەمبەر بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) وەرینەگرت فەرمووی: بەڵام رۆژی تێربم و رۆژێ برسی باشترە. وەئەگەر وەریشی بگرتایە هەمووی لەپێناوی خوادا سەرف دەکرد.

ئەمانەو چەندەها بەڵگەی ترمان هەیە کە باسمانکردووە لەو باسانەی پێشوودا پێم وایە دووبارەیە ئەگەر باسیان بکەینەوە جالەبەرئەوەی تا ئێستا لەسەردان بەخۆداگرتن بووە باسەکەمان وە زیاتر ئەم لایەنەمان روون کردووتەوە کەواتە بابچینە سەرباسی سوپاس و ستایش بزانین تا چ رادەیەك مایەی پلە بەرزییە ئەگەر یەکێك خوا زمانێکی سوپاسگوزاری پێ ببەخشێت.

## سوپاس و ستایشی خودا ﴿ الشكر ﴾

وە ئەوانیش کە سوپاسگوزاری بە پلە بەرزتر دادەنێن نموونەی بۆ دەهێننەوە و ئەڵێن:

---

[٩٦] سورة النحل/ آية ٩٦.
[٩٧] سورة البقرة/ آية ٤٥.

هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) زۆر لە پاڕانەوەکانی ئەوە بووە کە خوا زمانێکی پێ ببەخشێت کە پاراوبێت بەسوپاس و ستایشی خوا وە هەر شوکرانەی خوایە دەبێتە هۆی لەبیرنەچوونی ئەو بەندەیە لای خوا ﴿ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴾[98] وە بەهۆی زیادبوونی ماڵ و سامانە ﴿ لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾[99] وە هەرسوپاسگوزاریە دەبێتە هۆی ڕەزامەندی خوا ﴿ وَإِنْ تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ ﴾[100] وە پاداشتی بێگومانیان هەیە ﴿ وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ ﴾[101] لای خوا شوێنی ڕێزە بۆیە بەموسا (عليه السلام) دەفەرموێت ﴿ وَكُنْ مِنَ الشَّاكِرِينَ ﴾[102] وە وەسفی ئیبراهیم دەکات (عليه السلام) دەفەرموێت ﴿ شَاكِرًا لِأَنْعُمِهِ اجْتَبَاهُ وَهَدَاهُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴾[103] وە بەکەم ناوی بردوون دەفەرموێت ﴿ وَقَلِيلٌ مِنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ ﴾[104] و ﴿ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾[105] و ﴿ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴾[106] وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەندە شەوونوێژی دەکرد تەنانەت هەردوو قاچی ئاوسابوون عائیشە خێزانی وتی: بۆ وادەکەیت ئەی پێغەمبەر کە خوای گەورە لە تاوانی لەمەوپێش و لەمەوپاشت خۆش بووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی: ئەی نابێ بەندەیەکی سوپاسگوزاری خوابم[107]. وە فەرموویەتی: هەرکەس خوا چوار شتی پێ ببەخشێت ئەوە هەموو

---

[98] سورة البقرة/ آية ١٥٢.
[99] سورة إبراهيم/ آية ٧.
[100] سورة الزمر/ آية ٧.
[101] سورة آل عمران/ آية ١٤٤.
[102] سورة الأعراف/ آية ١٤٤.
[103] سورة النحل/ آية ١٢١.
[104] سورة سبأ/ آية ١٣.
[105] سورة الأنفال/ آية ٢٦.
[106] سورة البقرة/ آية ١٥٢.
[107] البخاري ٤٤٩/٨ ، ومسلم ٢٨٢٠.

خێرو چاکەی سەر زەوی و ڕۆژی دوایی پێبەخشیوە دڵێکی سوپاسگوزارو زمانێك یادی خوا بکات (ذاکر) وە لاشەیەك لەسەر بەلا ئارامبگرێت وە ئافرەتێك کە خیانەت نەکات لەخۆی و ماڵیدا[108]. وە دەفەرموێت: خوا هەر نیعمەتێکی بەبەندەیەکی بەخشی وە بەندەکە زانی بەوەی کە ئەم نیعمەتە لەلایەنی خواوەیە ئەوە خوا بەچاکە و سوپاسگوزرای بۆ دەنوسێت پێش ئەوەی سوپاسی خوا بکات لەسەری. وە خوا بە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴾[109] و ﴿ لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾[110] عەلی کوڕی ئەبو تالیب خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: نیعمەتی خوا بە سوپاسگوزاری بەندەکەیەوە بەستراوە وە سوپاسگوزاری خوایش بە زیادو زۆربوونەوە بەستراوە ئەمانە پەیوەندییان بەیەکەوە بەستراوە[111]. سوپاسکردنی خوا بەشێوەیش دەبێت دەربڕدرێت وەك زمان و دڵ دەردەبڕێت.

یەکێك لەیاوەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەڵێت چوومە لای پێغەمبەر شێوەم نارێك بوو، واتە جلوبەرگ چڵکن و پڵکن و دڕاو شێوەی سەروچاو تێکچوو بوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: سەروەت و سامانت هەیە؟ وتم: بەڵێ. فەرمووی: چ شێوە ماڵێك؟ وتم: لەهەموو جۆرە ماڵێك لە وشتر لە ئەسپ لەمەڕو ماڵات. فەرمووی: کەواتە خوا ماڵی زۆری پێبەخشیوی و پێتەوە دیار نییە[112]. لەشوێنێکی تردا دەفەرموێت: خوا پێی خۆشە ڕەنگدانەوەو شێوەی

[108] السلسلة الضعيفة ١٠٦٦ ضعيف الجامع ٧٥٦ الألباني ضعيف.
[109] سورة الضحى/ آية ١١
[110] سورة إبراهيم/ آية ٧.
[111] ذكره إبن أبي الدنيا كما قاله إبن القيم رحمه الله.
[112] أخرجه أحمد في مسنده ج١ ص٢٧٤ وسنده حسن الخ.. حديث عن نعمان بن بشير، عدة الصابرين ص١١٦ ذكره إبن أبي الدنيا.

نیعمەت بەبەندەکەیەوە دیاربێت. وە دەفەرموێت: هەرکەس سوپاسی شتی کەم نەکات سوپاسی شتی زۆریش ناکات هەرکەس سوپاسی خەڵکی نەکات سوپاسی خواش ناکات[١١٣].

❖ پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاری موسوڵمانان دەکات دەفەرموێت: ئەو کەسەی دەیەوێت بزانێت خوا چەندێ نیعمەتی پێبەخشیوە باسەیری ئەوانە بکات کەلەخواری خۆیەوەن سەیری لەخۆی سەرووتر نەکات[١١٤].

❖ عەبدوڵلای کوڕی عومەر خوا لێی رازی بێت دەڵێت ئێمە (واتە هاوەڵەکان) لەرۆژێکدا چەندەها جار بەیەك دەگەیشتین هەواڵی یەکترمان دەپرسی هەموومان سوپاسی خوامان دەکرد لەسەر نیعمەتەکانی، وە هەواڵ پرسیەکەشمان بەس لەبەر سوپاسکردنی خوا بوو.

❖ پرسیاریان لەخواناسێك کرد وتیان: سوپاسکردن لەسەر چاو کە خوا پێی داویت چۆنە؟[١] وتی: هەر چاکەیەکم پێ بینی بێت باسم کردووە وە هەر خراپەیەکم پێ بینی بێت شاردوومەتەوە. وتیان: ئەی گوێ؟ وتی: هەر خێرێکم پێ بیستبێت بەکارم هێناوە هەر خراپەیەکم پێ بیستبێت دوورەپەرێز بووم. وتیان: ئەی دەست؟ وتی: شتێك مافی خۆن بووبێت پێم وەرگرتووە وە مافی خوام تێدا قەدەغەنەکردووە. وتیان: ئەی سك؟ وتی: خوارەوەی بۆ خواردن سەرەوەی بۆ زانست و زانیاری ئەمانە هەمووی سوپاسگوزاری راستەقینەن وەکۆتایی پلەی راستەقینەی سوپاسگوزاریش ئەوەیە کە کڕنوش ببات و

[١١٣] سلسلة الصحيحة رقم ٤١٦ وأبوداود ٤٨١١ والترمذي ١٩٥٥.
[١١٤] متفق عليه.
[١] واتە سوپاسکردنی خوا بەچ شێوەیەك بکەین کە چاوی پێبەخشیوین.

بەکەوێت بەکڕنوشدا بۆ خـوا (سـجدة الشـكر). هـەروەك پێغەمبـەری خـوا کڕنوشێکی زۆر درێژی برد کە جوبریل هەواڵی بۆ هێنا هەرکەس سـەڵەواتێك بدا لە پێغەمبەر[١١٥] خوای گەورە دەجار سڵاواتی پێدەگەیەنێت وە کڕنوشی برد لەوکاتەدا کە خودا تکاکاری پێ دەبەخشێ بۆ گەلی موسوڵمانان (شفاعة) وە کڕنوشێکی برد لەوکاتەدا کە هەواڵی کوشتنی (أبو جهل)یان بۆ هێنا.

❖ ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێت جێنشینی پێغەمبەر کڕنوشی برد کاتێك هەواڵی کوشتنی موسەیلەمەی درۆزن یان بۆ هێنا.

❖ عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب کڕنووشی بـرد کـە بینـی ئـەوەی پێغەمبـەر وەسفی کردووە[→١] کوژراوە لەناو خەوارجەکان.

❖ وە کەعبی کوڕی مالیك کڕنوشی برد کە هەواڵی لێخۆشبوونی خوایان بۆ هێنا بەهۆی ئەوەی کە دواکەوتبوو لەجەنگی تەبوك.

❖ حەسەنی بەسری کڕنوشی برد کاتێ هەواڵی مردنـی حـەجاج یـان بـۆ هێنا.

لەبەرئەوەی کڕنووش واتای بەندایەتی و سوپاسـگوزاری تێدایـە بەرامبـەر بەخوا وە واتای گەورەیی و دەسەڵاتداری خوای تێدایە.

ئەو کڕنوش بەرانەی باسمانکرد کاتێك کڕنوشیان بردووە کـە ئـەوەی پێیـان خۆشە هاتووەتە دی وە ئەوانیش کڕنووشیان بردووە لەسـەر ئـەو خۆشـییە کـە ئاواتیان بووە، ئەمە ئەوپەڕی سوپاس و ستایش دەربڕینـە بـۆ خـوای گـەورە.

[١١٥] کتاب (فضل الصلاة على النبي ﷺ) ـ الألباني سنده صحيح.

[→١] پێغەمبەر وەسفی شێوەی زەلامێکی کرد کە ورگ زلو سەرسنگی گەورەی هەیە هەرکاتێك بینیان بیکوژن لەدوای خۆی وە هەواڵیدا کە ئەو زەلامە دەردەچێت لە موسڵمانان وە کۆمەڵەکەیشی دەردەچێت لە ئیسلام وەك چۆن تیر دەردەچێت لەکەوانەدا. وەکو ئیمامی عەلی حەدیسەکەی پێغەمبەر دەگێڕێتەوە (صحيح مسلم)دا.

وەزانایانی ئیسلام چەندەها وردەکاری باس دەکـەن لـەبارەی سوپاسـگوزاریەوە هەموو پڕ سوودو بەنرخە ئێستەش چەند وتەیەکی جوانیان لێ بـاس دەکـەین: وەك هەندێکیان ئەڵێن بەسێ پلە نەبێت سوپاسکردن تەواو نابێت و مافی خۆی پێ نادەیەت:

١ـ دان نان بەنیعمەتەکانی خوا.

٢ـ سوپاس و ستایشکردنی خوا لەسەری.

٣ـ بەکارهێنانی ئەو ماڵە لەپێناوی ڕەزامەندییەکانی خوا هەروەك ئـەڵێن ئەگەر ناتوانێت بەدەست سەرفی بکەین لـەپێناوی خـوادا (واتـە ڕەزیلـی) بـا زمانت پاراوبێت بەسوپاسگوزاری خوا.

سوپاسکردنی خوا بەسێ شت لەلەشدا سوپاسی تەواوی پێدەکرێت:

١) بەدڵ (هەست بەونیعمەتە بکەیت).

٢) بەزمان (سوپاس و ستایشی خوای پێبکات).

٣) ئەندامـەکانی لاشـە بـەکاری بهێنێـت لەڕەزامەنـدی خـوا و دوور لەتاوانباری..

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە کە ئایا ئارامگرتن یان سوپاسگوزاری کامیان پلـەیان بـەرزترە لای خـوای گـەورە، زانایـان ئـەم دوو شـێوازەیان بردۆتـەوە سەرخاوەنەکانیان کە هەژارێکی ئارامگر باشتر و پلە بـەرزترە لەسـەر هـەژارو نـەبوونی یەکـەی کـە هـیچ سـکاڵاو نارەزانییـەکی تێـدا دەرنـەبڕێت یـاخود دەوڵەمەندێکی سوپاسگوزار کەلـەپێناو ڕەزامەنـدی خـوا مـاڵو سـامانەکەی بەکاربهێنێت و سوپاس و ستایشی خوای لەسەر بکات.

هەریـەك لـەزاناكان لایـەكیان بەباشـترە دانـاوە تالایـەكی تـر بـەگوێرەی بیروبۆچوونی خۆیان و تێگەیشتن لەبەڵگەكان بـەڵام (إبـن القـیم) خواپاداشـتی بداتەوە هاتووە وەكو كۆبوونەوەیـەكی بـاوەڕداران تێكـەڵ لەهـەردوولا لەسـەر زمانیـان بەڵگـەكانی روون كردووەتـەوە تـاوەكو وەكـو شـێوەیەكی راسـتی بەسـەرهات. خوێنـەر لەبابەتەكـەی تێبگـات وەلـە دوای دارشـتنی باسـی هەردوولایان دەربڕینی هەموو راستییەكیان هەڵدەستێت بە (صـلح) و كۆتـایی هـاتن بەدووبەرەكایـەتی هـەردوولاو یاسـا (حكـم)ی راسـتی دەدات بەسـەر بابەتەكەدا و كۆتایی بەهەموو بـاس و لێكۆڵینەوەیـەكی نێوانیـان دەهێنێـت. بەشیتەڵ كردنەوە ئەیسەلمێنێت كە هـەردوو لایـان مایـەی خێـرو رەزامەنـدی هەردوو دونیایە هەریەكەی بەشێوەیەك: پلەی خێریان دەست دەكەوێت وەكو ئەم فەرموودانەی شیتەڵی دەكاتەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: هەژارەكانی گەلی من دەچـنە بەهەشـتەوە لەپێش دەوڵەمەندەكانەوە بەنیو رۆژ ئەویش ٥٠٠ سـاڵە[116][←] ئەمـەش بەڵگـە نییـە لەسـەر ئـەوەی كـە هـەژارەكان پلـەیان بـەرزترە وە پلـەیان زیـاترە لـە دەوڵەمەندەكان بەڵكو لەبەرئەوەیە هەژارەكان زووتـر یـاخود ٥٠٠ سـاڵ پـێش دەوڵەمەندەكانەوە دەچنە بەهەشتەوە كەلەدادگای خوا (محاسبة) زووتر تەواو دەبن چونكە خاوەنی ماڵ و سامانێكی زۆرتر نەبوون تاكو دادگاكـەیان درێـژتر بخایەنێت بەڵام دەوڵەمەندەكان لەبەرئـەوەی خـاوەنی مـاڵ و سـامانێكی زۆرن لێپرسراوی زیاتریان هەیەو درەنگتر لێ ئەبنەوە وە رەنگە دەوڵەمەندەكان لەبەر

---

[116] رواه الترمذي ٢٣٥٤ وصحيح سنن إبن ماجة ـ الألباني ٣٣٢٦.

[←] هەر رۆژێك قیامەت هەزار ساڵی ئێمەیە وەكو خوا دەفەرموێت ﴿ وَإِنَّ يَوْمًا عِنْدَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ ﴾.

لێپرسینەوە (محاسبة) درەنگتر بچێتە بەهەشتەوە و پلەی بەرزتر بێت لەهەژارێکی کە زووتر ئەچێتە بەهەشتەوە.

❖ کۆمەڵێك هەژار هاتن بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) وتیان: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) دەوڵەمەندەکان بەبۆنەی ئەوەوە کە پارەو سامانیان هەیە بەخێرو چاکە دەکەن و بەندە ئازاد دەکەن وە کردەوەیان زۆر دەبێت پێش ئێمە دەکەون بۆ چوونە بەهەشتەوە. پێغەمبەریش فەرمووی[117]: کارێکتان پێ بڵێم ئەگەر بیکەن ئێوەش وەك ئەوان خێروچاکەتان زۆر دەبێت یادی خوا بکەن لەدوای هەموو نوێژێك ٣٣ جار سبحان الله ، ٣٣ جار الحمدلله ، ٣٣ جار الله أكبر ، وە یەکجار لاإله إلاالله وحده لاشريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير. کاتێك دەوڵەمەندەکان ئەمەیان بیست ئەوانیش دەستیان کرد بەهەمان زیکرو یاد خوێندن. هەژارەکانیش زانیان بەمە چوونە لای پێغەمبەر (ﷺ) بۆیان گێڕایەوە کە دەوڵەمەندەکانیش بەوشێوەیە زیکر دەخوێنن سەرەرای دەوڵەمەندییەکانیان. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوە بەخشش و پلەیەکە خوا دەیبەخشێت بەو بەندانەی کە ویستی لەسەرە. لێرەدا مەبەستی هەژارەکان ئەوە بوو کە بگەنەوە بەکردەوەی دەوڵەمەندەکان، بەڵام پێغەمبەر پێی نیشاندان کە هەریەکەتان رێگەو کاری خێری تایبەتی خۆی هەیە.

بەڵام بائەویش بزانین دەوڵەمەندی ماڵ و سامان هۆیەکە بۆ تاقیکردنەوەی بەندەکانی، هەروەك هەژاریش تاقیکردنەوەیە کە بۆ دەرکەوتنی ئارام و رەزامەندی بەندەکانی وەك دەفەرموێت: ﴿ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِفَ الْأَرْضِ

---

[117] رواه مسلم ٤١٨/١ والبخاري.

وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ ﴾[118]، ﴿ وَنَبْلُوكُمْ بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴾[119]، ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾[120].

ئەمانە هەمووی بەڵگەن بۆ ئەوەی هەژاریی و دەوڵەمەندیی هۆیەکن بۆ تاقیکردنەوەی ئادەمیزاد لەدونیادا وەکو هەموو شتەکانی تر، هەروەك عبدالله کوڕی عەباس خوا لێی رازی بێت ئەفەرموێت: نەرمی و توندوتیژی و لەشساغی و نەخۆشی و هەژاری و دەوڵەمەندی و حەڵاڵی و حەرامی هەموویان بەڵان بۆ تاقیکردنەوە.

هەروەك باسمانکرد هەژارو دەوڵەمەند هەریەك پلەوپایە و خێری تایبەتی خۆی هەیە بەگوێرەی توانـاو بارودۆخی ژیانی خۆی وەکو و هێنانەوەی یەکسانییەك لەنێوانیاندا، لەبەرئەوە زۆرجار کاری هەژارێك دەچێتە ریزی کاری دەوڵەمەندێك، هەروەك جارێك سێ کەس هاتن بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) یەکەمیان وتی: سەد ئوقیەم هەبوو دە ئوقیەم لێکرد بەخێر. دووەمیان وتی: سود دینارم هەبوو دە دینارم لێکرد بەخێر. سێیەمیان وتی: دە دینارم هەبوو دینارێکم لێکرد بەخێر. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەمووتان لەپاداشتدا یەکسانن هەریەکەتان بەدەیەکی ماڵەکەتان کردووە بەخێر[121]. لەگەڵ ئەوەشدا سەد ئوقیە زیاترە لە سەد دینار وە سەد دینار زیاترە لە دە دینار.

❖ ئارامگرتن و سوپاسگوزاری خوا هەموو نیعمەتێکی مایەی تاقیکردنەوەیە وەکو پێغەمبەر سولەیمان فەرموویەتی کە خوا ئەو هەموو

[118] سورة الأنعام/ آية ١٦٥.
[119] سورة الأنبياء/ آية ٣٥.
[120] سورة الكهف/ آية ٧.
[121] رواه البيهقي كما في مسند أمام أحمد ج١ ص١١٥ في فضائل على بن أبي طالب (رضي الله عنه).

نیعمەتەی پــێ بەخشــی بــوو ﴿ هَٰذَا مِنْ فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ﴾ سورة النساء/ آية ١٣٥.

❖ پیاوێك جارێك بەعوسمانی کوڕی عەفانی وت خوا لێی رازی بێت: ئــەی خاوەن ماڵ و سامانەکان بەبۆنەی سامانەکانتانەوە خێروچاکە و حەج و بەندە ئازادکردن پاداشتی زۆرتان دەست دەکەوێت. ئیمامی عوسمان فەرمووی: ئێوە ئاوات بەئێمە دەخوازن و ئێمەش ئاوات بــەئێوە، ســوێند بــەخوا درهــەمێك لەسەر نەبوونی و هەژاری و کەم دەســەلاتی بکــەی بــەخێر پاداشــتی هــەزار درهەمی هەیە کەلەسەر پارەو ماڵێکی زۆر بیکەی بەخێر.[١٢٢]

❖ وە لە پێغمبەریان (ﷺ) پرســی: چــاکترین خێــر کامەیــە؟ فــەرمووی: لەسەر کەم دەسەلاتی[١٢٣] بەمەرجێك بزانیت کە ئارام دەگریت لەسەر نەبوونی و هەژاری.

❖ یەکێك چووە لای سەهلی کوڕی عەبدوللا خوا لێی رازی بێت وتــی: دز هاتووەتە ماڵەکەم هەرچی تیابوو بردوویەتی. ئەویش فەرمووی: سوپاسی خوا بکە ئەی ئەگەر دز بچوایەتە دڵتەوە (شەیتان) یەکتاپەرســتی لێتێکبدایتایــە چیت دەکرد ؟!

***وە ئێستاش با بێینە سەر بەڵگەی هەردوو لایان بۆ روونکردنەوەی باسەکە.***

## بەڵگەی هەژارەکان لەسەر پلەی هەژاری لای خودا :

هەژارەکان سەرەی وتوێژیانەو دەڵێن: پێشەکی ئەی دەوڵەمەندەکان خــوای گەورە لە قورئاندا باسی پارەو ماڵ ناکات تەنها بەم شێوانە نەبێت:

---

[١٢٢] عدة الصابرين ص١٧٣.
[١٢٣] مسند إمام أحمد وإبن حبان وأبي داود وإبن خزيمة وصحيح تهذيب الترغيب والترهيب ج١ ص٢٦٩.

١ـ خوای گەورە لەقورئاندا بەشێوەی زەم و مایەی یاخی بوونی ئـادەمیزاد ناوی دەبـات ﴿ كَلَّا إِنَّ الْإِنْسَانَ لَيَطْغَى ، أَنْ رَآَهُ اسْتَغْنَى ﴾[١٢٤] وە ﴿ وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الْأَرْضِ ﴾[١٢٥] مەبەستی هەردوو ئایەتەكە یاخی بوونی مرۆڤە لەكاتی دەوڵەمەندیدا.

٢ـ وە باسی دەكات بەهۆیەك بۆ تاقیكردنەوەی موسوڵمانان ﴿ إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ ﴾[١٢٦] وە ﴿ وَنَبْلُوكُمْ بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴾[١٢٧] واتـــە مایە تاقیكردنەوەو هەڵسەنگاندنە.

٣ـ وە ماڵ و سامان هـیچ شـتێك لەسـەر خاوەنەكـەی لانابـاتو نزیكـی ناكاتەوە لە خوا وەك دەفەرموێت ﴿ وَمَا أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ بِالَّتِي تُقَرِّبُكُمْ عِنْدَنَا زُلْفَى ﴾[١٢٨].

٤ـ ماڵ و سامان تامو چێژی ئەو كەسانەیە كە بەس لەدنیادا بەشیان هەیە وە لەرۆژی دواییدا بێ بەشن وەك دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ﴾[١٢٩] وە ﴿ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُمْ بِهَا ﴾[١٣٠] وەك پێغەمبەر (ﷺ) بـە عومـەری كـوڕی خەتابی فەرموو: ئەی رازی نابیت رۆژی دوایی بۆ ئێمە بێتو دونیا بـۆ ئـەوان بێت؟![١٣١]

[١٢٤] سورة العلق/ آية ٦ـ٧.
[١٢٥] سورة شورى/ آية ٢٧.
[١٢٦] سورة التغابن/ آية ١٥.
[١٢٧] سورة الأنبياء/ آية ٣٥.
[١٢٨] سورة سبأ/ آية ٣٧.
[١٢٩] سورة طه/ آية ١٣١.
[١٣٠] سورة الأحقاف/ آية ٢٠.
[١٣١] متفق عليه وصحيح سنن إبن ماجة ـ الألباني ٣٣٥٠.

٥ـ کاتێك باسی دەوڵەمەندەکان دەکات بەشێوەی لۆمەو خراپە باسیان دەکات ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُتْرَفِينَ ﴾[١٣٢] وە ﴿ وَإِذَا أَرَدْنَا أَنْ نُهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا ﴾[-] کەواتە دەوڵەمەندەکان هۆی سەرەکی تیاچوونی خەڵکین.

٦ـ خوای گەورە بەشێوەی رەخنە ناوی ئەو کەسانە دەبات کە پارەو ماڵیان خۆش دەوێت ﴿ وَتَأْكُلُونَ التُّرَاثَ أَكْلًا لَمًّا ، وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا ﴾[١٣٣].

٧ـ وە بەخراپە ناوی ئەمانە دەبات کە ئاواتیان ماڵی دنیایە وە وەسفی ئەوانە دەکات کە مەبەستیان رۆژی دواییە ﴿ فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ فِي زِينَتِهِ قَالَ الَّذِينَ يُرِيدُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا يَا لَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَا أُوتِيَ قَارُونُ إِنَّهُ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ، وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا وَلَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الصَّابِرُونَ ﴾[١٣٤].

٨ـ وە تەنانەت باسی ئەوانە بەخراپە دەکات کە گومانیان وایە بەس بەپارە و ماڵ هەموو شتێك دەکرێت وە هۆیەکی سەرەکییە ﴿ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا قَالُوا أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِنَ الْمَالِ ﴾[١٣٥].

٩ـ وە هەواڵمان پێدەدات کە ماڵ و سامان دەبێتە مایەی سەرقاڵی و بێئاگایی لەرۆژی دوایی ﴿ أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ ، حَتَّى زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ ﴾[١٣٦].

---

[١٣٢] سورة الواقعة/ آية ٤٥.
[-] سورة الإسراء/ آية ١٦.
[١٣٣] سورة الفجر/ آية ١٩-٢٠.
[١٣٤] سورة القصص/ آية ٧٩-٨٠.
[١٣٥] سورة البقرة/ آية ٢٤٧.
[١٣٦] سورة التكاثر/ آية ١-٢.

دوای ئـــەم خاڵانــە دەســت دەکــەن بەبەڵگــە هێنانــەوەی فــەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ بەهێزکردنی ئەم خاڵانە و دەڵێن:

ئەوە بوو خوای گەورە بە پێغەمبــەری فــەرموو: ئەگــەر دەتــەوێت کلیلــی هەموو گەنجینەی سەر زەویت پێدەبەخشم. بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) وەرینەگرت و فەرمووی: بەڵام رۆژێ برسی دەبم و رۆژێ تێر دەبم[137]. وە دەفەرموێت: (اللهم اجعل رزق آل محمد قوتا) واتە ئەی پەروەردگار رۆزی کەسی موحەمــەد بەگوێرەی پێویست بێت[138].

ئەگەر رۆژێ ماڵ و سامان باش بوایە پێغەمبــەر (ﷺ) وەریــدەگرت. وە ئیمامی ئەحمەد خوا لێی رازی بێت دەڵێت: عائیشە خوا لێی رازی بێت دەڵێت: ئافرەتێکی مەدینەیی هات بۆ لام و ئەو جێگایەی بینی کە پێغەمبەر لەسەری دادەنیشت کۆنەوشی بۆتەوە. کاتێك گەڕایەوە بــۆ ماڵــەوە پارچــەیەك راخــەری خوری بۆ ناردین. پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوە بۆ ماڵەوە بینــی فــەرمووی: ئــەوە چییە؟ وتم: فلانە ئافرەت ئەوەی بۆ ناردوین کاتێ راخەرەکەی بینیوە. فەرمووی: بۆی بنێرەوە. ئەڵێت: دووجارە پێی وتم کە بۆی بنێرمەوە بــەڵام منــیش حــەزم لێدەکرد لەماڵەکەمدا بێت، تا ســێ جــار پێــی وتم، ئەوســا فــەرمووی: ئــەی عائیشە[139] ئەگەر بمویستایە خوا شاخی بــۆ دەکــردم بــە ئــاڵتوون و زیــو دوای ئەخستم. ئەگەر دەوڵەمەندی باش بوایە پێغەمبەری خــوا (ﷺ) لەبچــوکترین شتەوە کە راخەرێکــە وەریــدەگرت و کــۆی دەکــردەوە تــا گــەورەترین شــت وە پێغەمبەری خــوا هــەموو دەم رەزامەنــد بــوو بەنــەبوونی و کەمدەســتو زۆر

[137] مسلم ٥٧/١٥.
[138] البخاري ٣٦١/١١ ، ومسلم ٢٧٣٦ ، وصحيح سنن إبن ماجة ٣٣٣٩.
[139] رواه أحمد والسلسلة الصحيحة الألباني ٢٤٨٤.

کۆنەکردنەوە هەموو کات ڕەزامەندبووە بەدان بەخۆداگرتن لەسەر برسێتی و تینوێتی و تێرنەبوون هەروەك لەم کۆمەڵە فەرموودانەی خوارەوە بۆمان دەردەکەوێت:

❖ ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: من بزانم پێغەمبەری خوا هەتا کۆچی کرد نە نانێکی گەنمی نەرم و نە مەڕێکی برژاوی قەت نەخواردووە[١٤٠].

❖ عائیشە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لەوکاتەوە خزموکەسوکاری هاتوونەتە مەدینە سێ شەو لەسەریەك نانی گەنمیان نەخواردووە هەتا کۆچی کرد.[١٤١]

❖ ئەنەس دەفەرمویت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کراسی ئاسنینی شەڕ (درع)ەکەی لەبری هەندێك جۆ لای خاوەنەکەی دانابوو تاپارەکەی بۆ دەبات لەبەرنەبوونی ماڵ.[١٤٢]

❖ عومەری کوڕی خەتاب دەفەرمویت: ئەمبینی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی وا هەبوو ئەمایەوە هیچ نەبوو بیخوات.[١٤٣]

❖ عەبدوڵڵای کوڕی عەباس خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمویت: پێغەمبەر (ﷺ) چەندەها شەو ئەمایەوە لای خێزانەکانی هیچ نەبوو بیخۆن.[١٤٤]

❖ فاتمەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێ لەتێ نانی هێنا بۆ باوکی. وە پێغەمبەر فەرموی: ئەم لەتە نانە چییە ئەی فاتمە؟ وتی: ئەوە لەتێك نانە دڵم

---

[١٤٠] رواه البخاري.
[١٤١] البخاري ٤٧٨/٩ ومسلم ٢٩٧٠.
[١٤٢] رواه البخاري ومسلم.
[١٤٣] صحيح ومسلم.
[١٤٤] رواه الترمذي برقم ٢٣٦٠.

تاقەتی نەگرت تا هێنام بۆت. پێغەمبەر فەرمووی: ئەمە یەکەم خواردنە دەچێتە دەمی باوکتەوە ماوەی سێ ڕۆژە.[١٤٥]

❖ وە ئیمام ئەحمەد دەگێڕێتەوە لەجابری کوڕی عەبدوڵڵاوە دەڵێت ئەو کاتەی پێغەمبەر چاڵەکەیان هەڵدەکەند (شەڕی خەندەق) بەدەوری مەدینەدا برسێتیەکی زۆر رووی تێکردین هەتا پێغەمبەر (ﷺ) وای لێهات بەردێکی لەبرسا بەست بە سکیەوە.[١٤٦]

❖ وە بەهەمان گێڕانەوە عوروە دەڵێت: گوێم لێبوو عائیشە خوا لێی رازی بێت دەیوت: مانگ بەسەرماندا تێپەڕ ئەبوو لەماڵێك لەماڵەکانی پێغەمبەردا ئاگر نەدەکرایەوە. عوروە وتی: ئەی پورێ[←] بەچی دەژیان؟ وتی: بە خورماو ئاو ناویان دەبرد بە (الأسودان)[١٤٧] واتە دوو رەشەکە لەبەر زۆر خواردنی.

❖ رۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) لەبرسا چوو بۆ مزگەوت وە کاتی پێغەمبەر (ﷺ) لەبرسا چوو بۆ مزگەوت وە لەدوای ئەو ئەبوبەکر و عومەریش چوون بۆ مزگەوت بەدوای یەکەوە وە کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) بینینی فەرمووی: بۆ لەم کاتەدا هاتوون بۆ مزگەوت؟ وتیان: لەبرسیەتیدا. فەرمووی: سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە منیش لەبەرئەوە هاتووم کە ئێوە لەبەری

---

[١٤٥] مسند إمام أحمد.
[١٤٦] رواه البخاري وإمام أحمد.
[←] عوروەی کوڕی زوبێر کوڕی ئەسمای خوشکی عائیشە بوو هەردووکیان کچی ئەبوبەکری صدیق بوون خوا لەهەموویان رازی بێت.
[١٤٧] رواه إمام أحمد ـ البخاري ٤٧٨/٩ ومسلم ٢٩٧٠.

هاتوون. دوای ئەوە چوون بۆماڵی ئەبوئەیوبی ئەنصاری خوا لێی رازی بێت لەوێ خواردنیان بۆ ئامادەکراو نانیان خوارد.[١٤٨]

❖ ئەبوتەڵحە دەڵێت: سکالای برسێتیمان کرد لای پێغەمبەر (ﷺ) وە هەریەکێك لەئێمە بەردێکمان لەسەر سکمان لادەبرد لەبرسا، پێغەمبەریش سکی هەڵدایەوە دوو بەردی لەسەر سکی لابرد.[١٤٩]

❖ ئیمامی عەلی خوا لێی رازی بێت دەفەرموێت: رۆژێك زۆرم برسی بوو هیچم دەست نەکەوت بیخۆم تەنانەت لەماڵی پێغەمبەریشدا چوومە دەرەوە گەڕام بۆ ئەوەی شتێکم دەست کەوێت بیخۆم، رۆیشتم چوومە لای دیوارێکەوە سەرم هەڵبڕی و بینیم جولەکەیەك ئاوی لەبیرێك هەڵدەگۆزا تا حوشترەکەی ئاو بدات. کاتێ منی بینی وتی: چیت دەوێت؟ ئەگەر ئاوم بۆ هەڵبکێشیت هەموو دۆلکەیەك دنکێك خورمات دەدەمێ. منیش دۆلکەکەم لێوەرگرت و ئاوم هەڵگۆزی هەموو جارێك دەنکە خورمایەکم لێوەردەگرت تا چنگم لێ پڕکرد دوای ئەوە دۆلکەکەم دانا و وتم بەسمە.[١٥٠]

❖ ئەبوبوردە دەڵێت چووینە لای عائیشە خوا لێی رازی بێت کراسێکی درێژی تا سەر ئەژنۆی پیشان داین زۆر زبرو رەق و قورس بوو وتی: پێغەمبەر ئەمانەی لەبەر دەکرد تا کۆچی دوایی[١٥١].

❖ ئەگەر دەوڵەمەندی بە سوپاسگوزاری خواوە باشتر بوایە لەهەژاری بە ئارامگرتنەوە ئەوا پێغەمبەری خوا هەڵیدەبژارد بۆ خۆی بەو ژیانە کەم

---

[١٤٨] رواه مسلم والترمذي ورياض الصالحين ص٢٢٤ باب فضل الجوع.
[١٤٩] وضعفه الألباني في ضعيف الترمذي برقم ٤١٣.
[١٥٠] روى الترمذي عن علي رضي الله عنه ومسند إمام أحمد ج١ ص١٣٥ فضل علي بن أبي طالب.
[١٥١] البخاري ١٤٩/٦ ومسلم ٢٠٨٠.

دەستیە نەدەژیا. وە هیچ هەڵنابژێرێ تا خوا بۆی هەڵنەبژێرێ و بەخێر و باشی نەزانێ بۆی چونکە خۆشەویسترین دروستکراویەتی. ئیمامی ئەحمەد خوا لێی رازی بێت ئەگێڕێتەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: باشترین خۆراك ئەوەیە بەئەندازەی پێویستی خۆت بێت وەباشترین زیکرو یادی خوا ئەوەیە کە بەنهێنی بکرێت[١٥١].

❖ وە پێغەمبەری خوا دەفەرموێت[١٥٢]: ئەگەر بینیتان یەکێك لەسەر تاوان بەردەوام بوو وە خواش ماڵ و سامانی پێدەبەخشێت ئەوە لە خۆشەویستیدا نییە کە پێیدەبەخشێت بەڵکو رۆچوونە لە تاواندا (ألإستدراج) دوای ئەوە ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ ﴾[١٥٣]. ئەگەر یادو فەرمانی خوایان لەبیرچوو وە بەرێوەیان نەبرد ئەوا خوا دەرگای هەموو شتێکیان بۆ دەکاتەوە چی داوا بکەن پێیان دەبەخشێ بۆ ئەوەی سەقاڵ بن تا کاتی مردن.

❖ ئیمامی ئەحمەد دەگێڕێتەوە رۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی ئەکرد بەکۆمەڵ بۆ یاوەرەکانی کەلەنوێژەکەدا بوو یەکێك لە ریزی دواوە بەدەنگی بەرز وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خورما سکی سوتاندووین واتە ئەوەندەمان خواردووە. کە پێغەمبەر گوێی لەمە بوو وتارێکی بۆ دان فەرموی: سوێند بەخوا ئەگەر بزانم گۆشت و نان لەکوێ هەیە دەرخواردم دەدان بەڵام کاتێك دێت بەسەرتاندا خواردنێکی زۆر وە خانوەکانیان دائەپۆشن وەك دیواری

---

[١٥١] رواه إمام أحمد وضعيف الجامع ٢٨٨٧ ولكن بلفظ (خير الرزق الكفاف) صحيح سلسلة الصحيحة ١٨٣٤.
[١٥٢] سلسلة الصحيحة رقم ٤١٣ وإمام أحمد.
[١٥٣] سورة الأنعام/ آية ٤٤.

كەعبە. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ڕۆژە باشە بۆ ئێمە یاخود ئەم ڕۆژە؟ فەرمووی: ئەمڕۆ خێرو باشترە لەو ڕۆژە (دووجار فەرمووی) وە فەرمووی: لەو ڕۆژە کوشتن و برین لەناویاندا بڵاودەبێتەوە.[١٥٤]

❖ وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: لەبۆ هەموو گەلێك فیتنەیەك هەیە کە مایەی لەناوچوونیانە فیتنەو هۆی لەناوچوونی گەلی من سامان و ماڵە[١٥٥].

❖ ئیمامی ئەحمەد خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا قسەی بۆ هاوەڵەکانی دەکرد یەکێکی هەژار هات و لای دەوڵەمەندێکەوە دانیشت دەوڵەمەندەکەش تۆزێك خۆی هێنایەوە یەكو جوڵا وەك ئەوەی خۆی لێبپارێزێت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی فلانەکەس ترسای دەوڵەمەندییەکەت بچێت بۆ ئەو یاخود هەژاریەکەی بێت بۆت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ خراپە هەیە لە دەوڵەمەندیدا؟ فەرمووی: بەڵێ دەوڵەمەندییەکەت ڕات دەکێشێ بۆ دۆزەخ[١] بەڵام هەژارییەکەی ئەو رایدەکێشێت بۆ بەهەشت. وتی: ئەی چۆن ڕزگارم ببێت؟ فەرمووی: یەکسانیکە لەگەڵیدا (واتە هەژار بێ بەش نەکەیت) وتی: باشە دەیکەم.[١٥٦]

❖ ئەگێڕنەوە ئەبو عوبەیدە خوا لێی ڕازی بێت بەشتومەك و ماڵێکی زۆرەوە گەڕایەوە مەدینە خەڵکی بیستیان ئەبوعوبەیدە بەشت و مەکەوە لە

---

[١٥٤] رواه إمام أحمد وإبنه عبدالله رحمه الله.

[١٥٥] رواه الترمذي رقم ٢٣٣٦ وقال صحيح حسن ، وفي رياض الصالحين ص٢١٩ باب فضل الزهد.

[١] ڕەنگە مەبەستی ئەو دەوڵەمەندییە بێت بەشێوەی ئەو پیاوە خۆی بەرز بگرێت بەسەر هەژاراندا و یارمەتی زۆریان نەدات.

[١٥٦] رواه إمام أحمد.

بەحرەین گەڕاوەتەوە هەموویان نوێژی بەیانی لە مزگـەوت بـوون دوای نوێـژ پێغەمبەر بینی زۆر هاتوون بۆ مزگەوت زەردەخەنەیەك گرتـی و فـەرمووی: وابزانم بیستوتانە ئەبوعوبەیدە بە شتومەکی زۆرەوە لەبەحرەین گەڕاوەتـەوە؟! وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: مژدە بدەن وە چیتان پێخۆشـە بیبەن سوێند بەخوا لەهەژاری ناترسم بەسەرتانەوە بەڵام دەترسم دونیاتان بـۆ بکرێتەوە وە ماڵ و سامانتان زۆر بێت ئێوەش هەموو دەم لەهەوڵدان دا بن بۆ ی وەکو گەلانی پێشوو تیاچوون بەهۆی ماڵ و دونیاوە[157].

❖ ئەگێڕنەوە رۆژێك پیاوێکی دەوڵەمەند تێپـەڕ بـوو بـەلای پێغەمبـەر و یاوەرەکانیدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: چی دەڵـێن دەربـارەی ئـەم پیـاوە؟ وتیان: ئەگەر بچێت بۆ داوای ئافرەت دەیدەنێ و تکا بکات تکای دەگێڕێت و هەرچییەکیش بڵێت گوێی لێدەگیرێت. دوای ئـەوە هـەژارێك تیپـەڕ دەبێـت. پێغەمبەر فەرمووی: چی دەڵێن دەربارەی ئەمە؟ وتیان: ئەگەر بچێت بۆ داوای ئافرەت نایدەنێ وە تکا بکات تکای ناگیرێت وە هەرچـیەکیش بڵێـت گـوێی لێناگیرێت. پێغەمبەر فەرمووی: ئەمە لەهـەموو سـەرزەوی خێـری زیـاتر و چاکترە لەوەی پێشووتر.[158]

❖ هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) بە هەژارە مەككییەکانی (أهل الصفة)[*] فەرمووی: ئەگەر ئەتانزانی چۆنن لای خوا حەزتان دەکرد ئەوەندەی تر هـەژار و کەمدەست بن. وە پێغەمبەری خوا مژدەیەکی داوە بە هەژارەکان کە نەیداوە

[157] البخاري ١١/ ٢٤٣ ومسلم ٩٥/١٨.
[158] رواه البخاري ٩/ ١١٧.
[*] مەبەست لەو هەژارانەیە کە پێغەمبەر لە گۆشەیەکی مزگەوتدا جێگای بۆ کردبوونەوە وە لەبەر بێ کەسی و پارەو ماڵ کۆچەرییەکانی مەککە بوون کەسیان نەدەناسی.

بە دەوڵەمەندەکان فەرموویەتی: موسڵمانە هەژارەکان دەچنە بەهەشتەوە پێش دەوڵەمەندەکان بەنیو ڕۆژ ئەویش (٥٠٠) ساڵە.[١٥٩]

❖ پێغەمبەر دەفەرموێت: دوو موسوڵمان بەیەك دەگەن لەدەرگای بەهەشتدا هەژارێکی موسوڵمان و دەوڵەمەندێکی موسوڵمان ڕێگەی هەژارەکە دەدەن دەچێتە بەهەشتەوە بەڵام ڕێگەی دەوڵەمەندەکە نادەن، دوای ماوەیەکی زۆر لەبەهەشت بەیەك دەگەن، هەژارەکە پرسیاری لێدەکات دەڵێت: بۆ ڕێگەیان نەدایت (واتە ئەوەندە دواکەوتیت)؟ تا وام لێهات وتم تیاچوویت؟ وتی: ئەی برا لەدوای تۆ توشی کارێکی زۆر ترسناك و گەورە بووم[*] تا رزگارم بوو.[١٦٠] ئەوەندەمان بەسە کە پێغەمبەری خواش (ﷺ) مژدەی بەهەشتی پێداوین کە زۆری دانیشتوانی بەهەشت هەژارەکانن وتیان دەوڵەمەندەکان زۆریان سووتەمەنی دۆزەخن، دەفەرموێت: سەیری بەهەشتم کرد زۆری بەهەشتییەکان هەژارەکانن وە سەیری دۆزەخم کرد زۆری دۆزەخییەکان دەوڵەمەندو ئافرەتن.[١٦١]

❖ ڕۆژێك عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف خوا لێی رازی بێت بە ڕۆژوو بوو هەندێك خواردنیان بۆ هێنا وتی: موصعەبی کوڕی عومەیر شەهید بوو زۆر لەمن باشتر بوو کفن کرا بە پارچە قوماشێك سەریان پێ دائەپۆشی قاچی دەردەکەوت قاچیان دائەپۆشی سەری دەردەکەوت وە حەمزەش بەپارچە قوماشێك کفن کرا لەمن باشتر بوو دوای ئەوان بەم شێوەیە دونیا بۆ ئێمە زۆر

---

[١٥٩] رواه إمام أحمد والترمذي وقال حسن صحيح ٢٣٥٤.

[*] مەبەستی لە دادگاو لێپرسینەوەی خوایە.

[١٦٠] رواه أحمد ٣٠٤/١ وأورده الهيثمي في المجمع ٢٦٣/١٠.

[١٦١] رواه البخاري ومسلم.

بــوو تاوامــان لێهــاتووه ئەترســێن ئــەم مــاڵ و ســامانه بــەش و پاداشــتی کردەوەکانمـان بێـت لـەدونیادا دوای ئەمــە ئەوەنـدە گریـا خواردنەکـەی بـۆ نەخورا"↤ .[162]

نەك هەر عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف کوڵی دەروونــی لەمبارەیــەوە کــوڵا بێت بەڵکو ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و ئەبوعوبەیدە و عــەممار و سەلمان و عەبدوڵڵای کــوڕی مەســعود و عائیشــە (خــوا لێیــان رازی بێــت و بەبەهەشتی بەرینیان شاد بکات) هەموویان بەو شێوەیە یادی دوارۆژ و بوونی سامانی ئەم دونیایەیان کردووەتەوە و کوڵــەی دەروونیــان هــاتووە و گریــاون کەلەچەندەها پەرتوکدا وتەکانیان نوسراوتەوە کە دەفەرموون:

❖ وەکو محەمەدی کوڕی عطـاء خوا لێی رازی بێت دەڵێــت: رۆژێ لەگــەڵ ئەبوبەکردا خوا لێی رازی بێت دانیشتین باڵدارێکی بینی فەرمووی: مژدە هەر بۆتۆ بێت لەو دارە دەخۆیت و ئەیکــەیت بەریقنــە و هــیچ لێپرســینەوەیەکت لەسەر نییە خۆزگە من لەشوێنی تۆ بوومایە. وتم: تۆ وادەڵێیت کــە هــاوڕێی پێغەمبەر (ﷺ) بوویت.

❖ هەروەك کاتێ کە سامان و پــارەو ماڵەکــەی کیســرایان هێنــا بــۆ لای ئیمامی عومەر خوا لێی رازی بێت کاتێ ئەو هــەموو پــارەو ماڵــەی بینــی دەستی کرد بە گریان. عەبــدولرەحمانی کــوڕی عــەوف وتــی: ئــەی ئــەمیری موسوڵمانان بۆ دەگریت؟ ئەمەرۆژی خۆشی و سوپاسی خوا مژدەیە. ئیمامی

↤ عەبولرەحمان خوا لێی رازی بێت مەبەستی ئەم ئایەتە بوو ﴿ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُمْ بِهَا ﴾.

[162] رواه البخاري عن إبن عبدالرحمن بن عوف.

عومەر فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەرکۆمەڵێك ئەمانە کەوتنە ناویان خوا هەردوو بەرەکایەتی و رق و کینە دەخاتە نێوانیان.

ئەمە مایەی ماڵ و سامانە هەروەك بەم شێوەیەی خوارەوە پێغەمبەر (ﷺ) باسی شێوازی دونیا و ماڵ و سامان دەکات، ئەگەر ماڵ و سامانی دنیا شوێنی رێز بوایە لای خوا فەرمانی نەدەدا بەدوورکەوتنەوەی و بوونە مایەی دووبەرەکایەتی بەڵکو فەرمانی داوە بەئارامگرتن تیایدا وە دنیا زیندانی موسوڵمانە وە ئەگەر رێزی هەبوایە لای خوا بەئەندازەی باڵە مێشێك نەیدەهێشێت کافر قومێك ئاوی لێبخوات[١٦٣] وە دنیا لای خوا وەکو مردارەوەبویەك وایە کە لە زبڵداندا فڕێی دەدەن[١٦٤] وەکو دڵۆپێك ئاو وایە لەدەریایەك[١٦٥] وە هەموو دنیا مایەی زیان و خراپە و دوورییە لەخوا بێجگە لەیادی خواو زاناو زانیاری نەبێت[١٦٦] وە فەرمانیداوە کە موسوڵمان وەك رێڕەو وابێت[١٦٧] تیایدا ئەگەر بەیانی کردەوە بەتەمای ئێوارە نەبێت وە ئێوارەی کردەوە بەتەمەمای بەیانی نەبێت. وە نەفرەتی کردووە لەوانەی بەندەی دونیاو درهەمن[١٦٨] وە دنیای کردووە بەوێنەی سەوزێکی شیرین[١] وە هەواڵی داوە خۆی یەکێکە لەوانەی لەدونیادا ئەژین وەکو رێڕەوێك وایە لەژێر سێبەری دارێکدا تۆزێك پشوو دەدات و دوای دەڕوان و بەجێی دەهێڵێت وە فەرمانی داوە دەبێت

---

[١٦٣] رواه الترمذی رقم ٢٣٢٠ وقال حديث صحيح، وإبن ماجة ٣٣١٨.

[١٦٤] رواه الترمذی رقم ٢٣٢١.

[١٦٥] رواه الترمذی رقم ٢٣٢٣ صحيح سنن إبن ماجة (الألباني) ٣٣١٦.

[١٦٦] البخاري ١١/ ٢٣٣.

[١٦٧] صحيح سنن إبن ماجة ٣٣٢٢ والترمذی برقم ٢٣٣٣.

[١٦٨] صحيح سنن إبن ماجة ـ الألباني ٣٣٣٦ والبخاري ٢٥٣/١١ بلفظ (تعس) ولفظ (لعن) ضعفه الألباني في ضعيف الترمذي برقم ٤١٤.

[١] مەبەست لە سەوزە دنیا لەبریق و باقدا وەك سەوزەیەك وایە وە نیعمەتەکانیش وەکو شیرینییەکەی وایە.

لەژیانی دونیادا سەیری لەخوار خۆتەوە بکـەیت[→I→I] وە هـیچ شـتێك ئامـانجی دونیا نییە بێجگە لەبەڵاو خراپە و دووبەرەکایەتی نـەبێت وە هـەواڵی داوە بـە رزگاربوونی ئادەمیزاد لـە دونیـادا بەدوورکەوتنـەوە و پتـەوکردنی ئیمـانی وە هەموو جار دەیفەرموو: خوا ئەگەر بەندەیەکی خۆش بوێت دەیپارێزێت لـەدنیا وەکـو چـۆن نەخۆشـێك ئـەپارێزێت لـە خـواردن و خواردنـەوە کـە زیـانی پێدەگەیـەنێت[169] وە نموونـەی گێـڕاوە بـەکۆتایی خـۆراکێکی زۆر خـۆش کـە ئادەمیزاد دەیکـات بـە پاشـەڕۆك وە لەپێشـدا چـەندە بـەتام و بـۆن خۆشـە. لەکۆتاییشدا چەندە بۆنی پیسە دونیا وەك ئەو خواردنە وایە.[170]

❖ وە کاتێك عوسمانی کوڕی **مضعون** خوا لێی رازی بێت کۆچـی کـرد نێوان هەردوو چاوی ماچ کرد و فەرموی: خوات لیّ رازی بێت ئەی عوسمـان لایەنی دونیـات نـەگرت و دونیـاش بەسـەرتا زاڵ نـەبوو[171]. وە سـەلەف[172] فەرموویانە: سەری هەموو هەڵەیەك خۆشەویستی دونیایە. ئەمانـە هـەموو حاڵ و چۆنیەتی ژیانی دانیشتوانی دونیان لەچاو رۆژی دواییدا.

### *دونیا بەشێوەی نمونە:*

سەرەتاو کۆتایی و ئامانجی دونیا بەشێوەی چەند نمونەیـەك بـاس دەکـەین تازیاتر روون کردنەوەی باسەکەمان بێت:

---

[→I→I] واتە: ئەوانەی کەلەتۆ کەمتر پارەوماڵیان هەیە. رواه مسلم.

[169] صحيح تهذيب الترغيب والترهيب رقم ٣٠٩٨.

[170] سلسلة الصحيحة ـ ألألباني رقم ٣٨٢.

[171] أخرجه الترمذي ١٣٠/٢ ومجمع الزوائد ٢٠/٣ وصححه أحكام الجنائز للألباني ص٢٨.

[172] مەبەست لە سەلەف (صحابه و تابعين)ە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و صەحابەیان بينيوە لەو سەردەمە ژیاون لەبەرئەوەیە یان دەوترێت سەلەف یا پێشینی سەردەمی ئیسلام.

**نمونەی یەکەم/**

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویێت: نمونەی مــن و دونیــا وەك ڕێبوارێــك وایــە لەژێر سێبەری دارێکدا کەمێك پشــوو بــدات و دوای ئــەوە هەڵسـێت و جێـی بهێڵێت[173]. دونیا وەك سێبەری ئەو دارە وایە کە ماوەیەك ئەمێنێتەوە و دوایی کۆتایی پێدێت. کەواتە سێبەر شایستەی ئەوە نییە خانووبەرەو شتومەکی تیادا بنیاد بنرێت.

وە دەفەرمویێت (ﷺ) ڕۆژی دونیا لەچاو ڕۆژی کۆتاییــدا وەك ئــەوە وایــە پەنجە بخەیتە دەریایەکەوە دوای ئەوەی دەریبێنیت و سەیری بکەیت چەند ئــاوی لەگەڵدا دێتە دەرەوە[174]. بێگومان دڵۆپێك و دوو دڵۆپی ئاوی پێوە دێتە دەرەوە واتە دونیا بەو ئەندازەیەیە.

**نمونەی دووەم/**

دونیا وەك ئەو خۆراك و خواردنە ڕازاوەی دونیا وایە کــە ئــادەمیزاد ئــەی خوات و ئەبێت بەو پاشەڕۆکە هەتا خواردنەکە بەتامو خۆشتر و بەلەزەتتر بێـت زیاتر پاشماوەکەی پیستر دەبێت.[175]

وە هەندێك لە پێشین (سلف) زۆرجار ئەیانفەرموو: بابڕۆین دونیاتان پیشان بدەین ئەیانبردن بۆ سەر زبڵدان و ئەیان وت سەیر بکەن ئەوە میوەو مریشــك و هەنگوین و چەوراییەکانتانە.

**نمونەی سێیەم/**

[173] رواه إمام أحمد وفي سلسلة الصحيحة للألباني رقم ٤٣٨ والترمذي ٢٣٧٨.
[174] رواه مسلم ١٩٢/١٧ وصحيح سنن إبن ماجة رقم ٣٣١٦.
[175] رواه الإمام أحمد ـ سلسلة الصحيحة ٣٨٢.

وەکو پاپۆڕێك وایە کۆمەڵێکی تیادا سوار بووبێت وە ڕێگەیان بکەوێتە نیوەدوورگەیەکەوە، خاوەن پاپۆڕکە بڵێت بەخەڵکەکە بۆ پشوودان کەمێك لائەدەینە ئەو دوورگەو وشکانییە بەڵام ئاگاداربن و دوانەکەون لەکاتی خۆی تاوەکو پاپۆڕەکە بەجێتان نەهێڵێت. کاتێك پاپۆڕەکە لایدایە دوورگەکە خەڵکەکە بڵاوبوونەوە بەباخ و بێستانەکان و بەرزی و نزمی و کانیاوی دورگەکەدا، ماوەیەکی پێچوو هەندێکی کەمیان لەترسی ئەوەی پاپۆڕەکە بەجێیان نەهێڵێت زوو گەڕانەوە بۆ ناو پاپۆڕەکە و شوێنی باش و فراوانیان گرت و هەندێکیشیان سەرقاڵ بوون بەسەیرکردنی گوڵ وگوڵزارو دەنگی ئەو باڵندانەوە کە دەیان خوێند وە بەکۆکردنەوەی بەردی هەمەڕەنگ و جوان بەڵام لەپڕدا بەبیریاندا هاتەوە کە پاپۆڕەکە بەجێیان دەهێڵێت ئەگەر دوابکەون، بەپەلە گەڕانەوە و بەباوەشیانەوە کۆمەڵێك گوڵ و بەروبووم و میوەیان پێیە کاتێك گەڕانەوە بۆ ناو پاپۆڕەکە بینیان شوێنی باشیان بۆ نەماوە تەنانەت ئەو شتانەی پێیانە جێگای نییە دایبنێن ناچار دەیانخستە باوەشیان و سەرملیان وەپەشیمان بوونەوە بەهێنانی ئەو شتانە و سیس‌و زەرد و بۆگەن هەڵگەڕان. بەڵام کۆمەڵێکی تریان زۆر دوورکەوتبوونەوە لەدوورگەکە بەبەردەوام دەگەڕان بۆ سەیرکردنی چڕی ئەو ناوباخ‌و گوڵزارانەی تیایەتی. لەم کاتەدا پاپۆڕەوانەکە بەدەنگی بەرز هاواری کردو شاوری گەڕانەوەی لێدا، بەڵام بەهیچ شێوەیەك گوێیان لێ نەبوو، لەبەرئەوەی زۆر دوورکەوتبوونەوە وە سەرقاڵ بوون بەبۆنی ئەم گوڵ و راکێشانی ئەم چڵ و هەردەمە تامی جۆرە میوەیەك وە گوێگرتن لەو باڵندە و لەگەڵ ترسێکی زۆر لەمارو دووپشك و شێرو ئاژەڵە درندەکان کە زیانیان پێبگەیەنن لەدوای ئەوە پاپۆڕەکە دەمێك کەوتبووە ڕێ و

دوورکەوتبووەوە بەڵام ئەم کۆمەڵە هەر نەهاتەوە بیریان نە پاپۆڕو نەسەفەر تا وایان لێهات هەندێکیان هاتنەوە سەر رووبارەکە سەیریان کرد دەمێکە پاپۆڕەکە رۆیشتووە ئەوان بێئاگابوون لێی هەتا هەموویان مردن وە هەندێکیشیان لەناو چڕی دارستانی دوورگەکە دڕندە لەناوی بردن و وە هەندێکیشیان بێ سەرو شوێن بوون. ئەمانە هەمووی نمونەی دونیان ئەوانەی یەکەمجار گەڕانەوە وە بۆلای پاپۆڕەکە و شوێنی باشیان گرت ئەوانە هیچ گرنگییەکیان بەدونیا نەدا و سەرفرازبوون وە ئەوانەش دووەمجار گەڕانەوە بەشت و مەکەکانیانەوە کە هێنابوویان رزگاریان بوو بەڵام کردەوەی خراپیان هەبوو کە بووبە بۆگەن بەسەریانەوە، وە ئەوانەی کۆتایی بەبێ سەروشوێن نەگەڕانەوە تیایدا مردن و لەناوچوون ئەوانە بوون گرنگیان بەدونیا ئەدا تا دونیا لەناوی بردن بەبریق وباقەکەیەوە سەرقاڵی کردبوون لەهەموو بیرکردنەوەیەك.

## نموونەی چوارەم/

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: نمونەی من و دونیا وەکو کۆمەڵێك وایە کۆچ دەکەن بەشوێنێکی زۆر دووردا هەرناگەنە ئاوەدانی تاوایان لێدێت هیچ هیوایەکیان نامێنێت و نان و ئاویان کەمێك پێ ماوە نازانن بیخۆن یاخود نەیخۆن رێگا ماوە یان نەماوە، تا بگەنە ئاوەدانی لەم کاتەدا پیاوێکیان لێ دەردەکەوێت لە دوورەوە ئەوانیش دەڵێن دیارە نزیك بووینەتەوە لە ئاوەدانی کە پیاوەکە ئەگاتە لایان پرسیاریان لێدەکات ئەوانیش دەڵێن ئەم شێوەیەین کە ئەمان بینیت. ئەڵێت ئەگەر بتانبەمە شوێنێك کانیاو سەوزە بێت چیم دەربارە دەکەن؟ وتیان هەرگیز لە قسەت لانادەین. ئەڵێت باشە پەیمان ئەدەن بەخوا کە راست دەکەن؟ ئەوانیش پەیمانی ئەدەن بەخوا بەهیچ شێوەیەك لەقسەی لانەدەن

پاشان ئەیان گەیەنێتە شوێنی سەوزەو کانیاو ماوەیەك تیایدا دەمێننەوە دوای ئەوە پێیان دەڵێت ئەی خەڵکی خۆتان ئامادەکەن بۆ کۆچکردن. ئەوانیش دەڵێن: بۆ کوێ؟ ئەویش دەڵێت: بۆ لای ئاوێك و کانیاوێك و سەوزاییەك زۆر خۆشتر و دڵگیرتر بێت لێرە. زۆربەی کۆمەڵەکە دەڵێن بەخوا شوێنی وامان دەست ناکەوێت و بەتەما نەبووین ئەمەشمان دەست کەوێت ژیانێکمان ناوێت لەمە باشتر بێت! وە لەو کۆمەڵە کەمێکیان ئەمێنێتەوە و ئەڵێن: ئەی ئێوە نەبوون پەیمانتان دا بەخوا لەقسەی ئەم پیاوە دەرنەچن؟ یەکەمجار راستی نەکرد ئێمەی هێنا بۆ ئێرە؟ ئەمجارەش هەر راست دەکات!! وەکو یەکەمجار. ئەو کۆمەڵە کەمەی بەگوێی پیاوەکەیان کرد لەگەڵیا رێکەوتن و کۆچیان کرد ئەوانیش کە مانەوە زۆر بوون ماوەیەك مانەوە تا دوژمن هێرشی بۆ هێنان و زۆریان کوژران ئەوەشی کە مایەوە بەدیل گیران.[176]

لەم نمونەیەدا پێغەمبەر (ﷺ) وەکو ئەو پیاوە وایە کە ئەمانی برد بۆ شوێنی باش ونەبڕاوە وە کەمێك بەراستی بەگوێیان کردو دوای کەوتن و رزگاریان بوو ئەوانیش کە بەگوێی ناکەن و باوەڕی پێناکەن وە گرنگیان داوە بەدونیا وەکو کۆمەڵە زۆرەکەیان بەسەردێت.

## نمونەی پێنجەم/

موستەوریدی کوڕی شەداد دەڵێت: من لەگەڵ ئەوانەدابووم کە وەستابوون لەگەڵ پێغەمبەری خوا لەسەر مردارەوەبوویەك، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەمە دەبینن کە زۆر پیس و بێ نرخ بووە لای خاوەنەکەی بۆیە فڕێی داوە.. سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە دونیا لای خوا لەم مردارەوەبووە پیستر

[176] رواه إبن أبي الدنيا وأحمد والبزار والطبراني وفيه إنقطاع.

و بێنرخ ترە.[١٧٧] لەبەرئەوە رەنگە لەو مردارەوەبووە خوری و پێستەکەی یەکێك سوودی لێوەرگرێت بەڵام دونیا ئەو سوودە نرخەشی نییە بۆیە لای خوا کەمترە.

## نمونەی شەشەم/

نمونەی دونیا وەك خەڵك و دەریایەك وایە پێویستە لەسەر خەڵکی پاپۆڕی رزگاربوون لە (سفينة النجاە) ببڕن و بپەڕنەوە ئەوبەر کە ماڵ و شوێنانی لێیە هەندێك لەخەڵکی نەفام تا نیوەی رێگاکە سوار پاپۆڕەکە دەبن لەنیوەیدا دەڵێن بەمەلەکردن دەیبڕین تا دەگەینە ئەوبەرەوە، ئەکەونە مەلەکردن هەتا هێزیان تیایە دەڕۆن دوای ئەوە هێزیان نامێنێت و ناتوانن مەلە بکەن تیا دەچن و ئەخنکێن، بەڵام ئەوانەی کە سواری پاپۆڕەکە بوون رزگاریان ئەبێت وە بەمەبەستی خۆیان ئەگەن وەکو ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەر نوحدا سەلامی خوای لێبێت وان کە بەسواری پاپۆڕەکە رزگاریان بوو.

لێرەدا پاپۆڕەکە وەکو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت وایە خوا ناردوونی بۆ رزگارکردنی ئادەمیزاد لە تیاچوون و نوقم بوون لەتاوان، دونیاش وەکو دەریایەکە ئەوەی تیارۆچێت ئەبێت بەمایەی لەناوبردنی.

## نمونەی حەوتەم/

دونیا وەکو جامێك هەنگوین وایە کە مێش دەورەی لێئەدەن هەندێکیان لە لێواری جامەکە ئەنیشنەوە ئەوەی مەبەستیانە لێی دەخۆن و دوایی ئەفڕن وە ئەوانەی ویستی زۆر و تەماحاوین لەلێواری جامەکە تێر ناخۆن دەچنە ناوەڕاستی جامەکە بۆ خواردن تاوایان لێدێت نوقم دەبن و ناتوانن دەربچن.

## نمونەی هەشتەم/

[١٧٧] رواه الترمذي برقم ٢٣٢١، صحيح سنن إبن ماجة الألباني رقم ٣٣١٨.

کۆمەڵێك لەشوێنێکدا نیشتەجێ دەبن و ماڵ و سامانی زۆریان دەبێت وە یەکێك پەیدا دەبێت هاواریان لێدەکات وە دەڵێ: ئەی خەڵکینە بەم دووچاوەی خۆم سوپایەکی گەورەی دوژمنم بینیوە لەو دیو ئەو چاڵە هەتا زووە بادەربچین وە ئێرە بەجێ بێڵین و رزگارمان بێت. زۆریان ئەڵێن چۆن ئێمە ئەم ماڵ و سامانە بەجێ بێڵین هەندێکیان بەگوێی دەکەن دەست دەکەن بە کۆچ کردن ئەوەی بۆیان بڕوات لەگەڵ خۆیان دەیبەن تا رزگاریان دەبێت و دەرئەچنە بەڵام ئەوانەی کە مانەوە دوژمن لەپڕ هێرشێك ئەدات بەسەریاندا و هەموویان لەناو دەبەن بەخۆیان و ماڵ و سامانیانەوە. کەواتە ئەوانەی گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ناکەن ئەنجامی کارەکانیان تیاچوونە، پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرموودەیەکی (متفق علیه)[178] نمونەی خۆی و دونیا بەم شێوەیە باس دەکات.

## نمونەی نۆیەم/

پێغەمبەری خوا مەسیحی کوڕی مەریەم (علیه السلام) دونیای لەشێوەی پیرەژنێکی پیردا بینی کە هەموو جۆرە خشڵێکی پێوە بوو پرسیاری لێکرد چەند شووت کردووە؟ وتی: لە ژمارە نایەت! فەرمووی: هەموویان مردن یاخود تەڵاقیان دایت؟ وتی: نەخێر بەڵکو هەموویانم کوشتووە. مەسیح سەلامی خوای لێبێت فەرمووی: تیاچوون بۆ ئەوانەی لەمەودوا شویان پێدەکەیت کە پەند لەوانەی پێشوو وەرناگرن و یەکەیەکە لەناویان دەبەیت و خۆیان ناپارێزن لەتۆ.

وە لە وتەیەکی تردا مەسیح دەفەرموێت: دونیا مەکەن بەخوای خۆتان بانەتان کات بەبەندەی خۆی وە بزانن بناغەی هەموو تاوانێك خۆشەویستی دنیایە رەنگە خۆشەویستی دنیا خەمو خەفەتێکی زۆر بەدوایدا بهێنێت خۆشی

[178] البخاري ٢١٨/٣ ومسلم ٢٢٨٣.

دنیا تالّی ڕۆژی دواییه، ڕێزمەگرن لەدنیا بالەرۆژی دوایی ڕێزگیراوبن، هەموو ڕۆژێکی ڕاکێشانه بۆ تیاچوون و لەناوبردن ئەی بەنی ئیسرائیل ماڵەکانتان با وەك ماڵی میوان وابێت ئێوه هەر ڕێبوارن لەدونیادا، ئەی هاوەڵانم کێتان دەتوانێت لەسەر شەپۆلی ئاودا خانوو ماڵ دروست بکات؟! وە پرسیاریان لێکرد وتیان: پیاوێك دەچێت بەڕێگەیەکدا پارچە ئاڵتونێك ئەبینێت و خۆی لێ لائەدا و هەڵی ناگرێت و پیاوێکی تریش بەو ڕێگەیەدا ئەڕوات و هەڵیدەگرێتەوە سەرفی دەکات لەپێناو خوادا کامیان باشترە؟! فەرمووی: ئەوەیان کە ئاوڕی لێناداتەوەو هەڵیناگرێتەوە. ئەمە فەرموودەی مەسیحە (علیه السلام) کە حەزی نەکردووە بەهیچ جۆرێك گرنگی بدرێت بە دونیا لەبەرئەوە ڕەنگە ئەو ئاڵتونە ببێتە هۆی دووبەرەکایەتی و نەدرێت بەخاوەنی ماف ڕەوای خۆی (مستحق) وە کە ئەیاندرێتی ببێتە هۆی تاوانباری واتە بەکاری بێنن لەتاواندا واتە بەهۆی ئاڵتونەکەی ئەمەوە بوو تووشی تاوان بوون کەواتە هەڵنەگرتن و ئاوەڕنەدانەوە لێی باشترە.

هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) سامانی دونیای نەئەویست وە ئەگەر وەریشی بگرتایە سەرفی دەکرد لەپێناوی خوادا ئەمانە هەموویان ترساندن (الترهيب)ن بۆ ئادەمیزاد وە بۆ زۆر گرنگی نەدان بەدونیا نەك وازهێنان بەیەکجارەکی هەروەها دونیا نموونە کراوە بەخەو وە ژیانی بەخەو بینینەوە وە مردن بەهۆشکردنەوە و ئاگادار بوونەوە لەخەو دونیا کێڵگەیەکە کردەوە تیایدا تۆوەکەیەتی کە ئەیچێنن وەبەرهەمەکەی دوای دروێنە ئەکات وە نمونە کراوە بەخانوویەك دوو دەرگای هەبێت لەم دەرگایەوە دەچێتە ژووورەوە لەو دەرگایەوە دێتە دەرەوە. وە نمونەکراوە بە خواردنێکی بەتامو بۆن خۆش بەلام ژەهراوی

کراوه ئەوەی ئەیخوات ئەیکوژێت و نموونه کراوه بەخواردنێك دوای ئەوەی ئەوەی لەش سوودی خۆی لێوەردەگرێت ئەگەر بمێنێتەوه لەلەشدا خاوەنەکەی تووشی ئێشو ئازار و ناخۆشی دەکات.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود خوا لێی رازی بێت دەفەرموێت: هەموو کەس لەدونیادا میوانه وه ئەوەی هەیەتی راسپاردەکانیەتی میوان لەسەر سەفەرە، ئەڕوات و راسپاردەیش دەدرێتەوه بەخاوەنەکەی. وه یەکێك پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) دەکات چ کردەوەیەك بکەم باشه که خواو خەڵکی خۆشیان بوێم؟ فەرمووی: دووره پەرێز ببه لەدونیا خوا خۆشی دەوێیت.. دوورەپەرێز بە له داواکردن لەخەڵکی خۆشەویست دەبی لای خەڵکی.[١٧٩]

❖ ئیمام ئەحمەد دەگێڕێتەوه پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: سێ شت هەیه سوێندی لەسەر دەخۆم وه هەندێ شتتان پێ دەڵێم لەبەری بکەن ئەو سیانه سوێندی لەسەر ئەخۆم[١٨٠] هەر ماڵێك خێری لێبکرێت کەم نابێتەوه، هەر ستەمێکیان لەبەندەیەك کرد و ئارامی لەسەر گرت خوای گەوره هەر سەری دەخات و دەسەڵاتی پێ دەبەخشێت هەربەندەیە داوای کرد لەهەر کەسێك بۆ شتێك خوای گەوره هەر دەرگای پێویستییەکی تری لێدەکاتەوه.

وه ئەو شتانەش که وتم لەبەری کەن دونیا بۆ چوارکەسە: بەندەیەك خوا سامان و زانینی پێ دەبەخشێت ئەو ماڵەی لەپێناوی خوا ئەبەخشێتەوه و یارمەتی خزمەکانی ئەدات، وه ئەزانێت چەنده مافی خوای تێدایە ئەی بەخشێت ئەم بەندەیە باشترین شوێنی هەیە لای خوا، وه بەندەیەك خوا زانستی

[١٧٩] صحیح سنن إبن ماجة ـ الألباني رقم ٣٣١٠.

[١٨٠] واته پێغەمبەر سوێندی لەسەر دەخوات که بێگومان وایه ئامانجی ئەو سیانەیە.

پێ دەبەخشێت بەڵامماڵی پێ نابەخشێت ئەڵێت ئەگەر ماڵم هەبوایە وەك فلان کەس ئەم بەخشیەوە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەم دووانە لەپاداشتدا یەکسانن وە بەندەیەك خوا ماڵی پێدەبەخشێت وزانستی پێ نابەخشێت ماڵەکەی هەروا سەرف دەکات مافی خوای تیا ناداتو یارمەتی خزمو کەسی نادات ئەمە خراپترین شوێنی هەیە لای خوا.. وە بەندەیەك خوا ماڵ و زانستی پێ نەبەخشیوە ئەڵێت خۆزگە ماڵم ببوایە وەکو فلانە کەس بم بەخشیایەتەوە بمبردایە بەڕێوە (بەشدارە لەگەڵ دەوڵەمەندەکاندەکەدا بەگوێرەی نییەتی)[180].

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

ئادەمیزاد رزگاری نابێت لەرۆژی دوایی تا پرسیاری لێنەکرێت لەچوار شتدا:

- ❖ تەمەنی لەپێناوی چیدا بردووتە سەر.
- ❖ وەکاتی گەنجیەتی لەپێناوی چیدا بەکارهێناوە.
- ❖ ماڵەکەی لە چ سەرچاوەیەك پەیداکردووەو لەپێناوی چیدا سەرفیکردوە
- ❖ وە لەو زانیاریەی ئەتزانی تا چەندێ کردەوەت پێکردووە.[181]

ئێستەش بەفەرموودەیەکی ئیمامی عەلی خوا لێی رازی بێت و حەسەنی بەسری خوا لێی رازی بێت کۆتایی پێ دێنین:

❖ عەلی کوڕی ئەبوتالێب خوا لێی رازی بێت ئەفەرموێت لەوەسفی دنیادا: دونیا خانوویەکە هەرکەس تێیدا گەنج بێت پیر دەبێت وە هەرکەس نەخۆش بێت پەشیمانە تێیدا و هەرکەس هەژاربێت تێیدا خەفەت بارە وە هەرکەس دەوڵەمەند بێت تێیدا تووشی بەڵاو ناخۆشی دەبێت وە لەحەڵاڵەکانی دونیادا لێپرسینەوە هەیە وە لە حەرامەکانیدا سزای ئاگرە.

---

[180] أخرجه: صحيح إبن ماجة الألباني رقم ٣٤٠٦ والترمذي ٢٣٢٥ ومسلم ٢٥٧٨.
[181] رواه الترمذي وقال حديث صحيح ٢٤١٦.

❖ وه حەسەنی بەسری خوا لێی رازی بێت لەنامەیەکدا بۆ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ئەنوسێت: دونیا شوێنی کۆچکردنە نەك شوێنی داکوتان و مانەوە وە پێغەمبەر ئادەم (عليه السلام) لە سزای هەڵەکردنەکەیەوە نێراوەتە دونیا.

کەواتە شوێنێك کەلەئەنجامی سزادا بخرێتە ناوی ئەبێت چ خۆشی و حەواندنەوەیەکی تێدا بێت بەڵکو لەدنیادا بەشوێنی سزا دەوترێت بەندیخانە سجن بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نمونەی دنیای بەبەندیخانە لێکداوتەوە بۆ موسڵمانان.[182]

## بەڵگەی دەوڵەمەندەکان لەسەر پلەی دەوڵەمەندی لای خودا :

دوای گوێگرتنێکی دوورودرێژ و بێدەنگییەکی تەواو دەوڵەمەندەکانیش هەڵسان بەوتاردان چەند ئایەتەو حەدیسی و شیتەڵ کردنەوەیەکیان پێشکەش کرد بەجۆرەی خوارەوەی دەستیان پێکرد:

یەکێکیان هەستا بەناوی دەوڵەمەندەکانەوە وتی: ئەی هەژارەکان باشترین بەڵگەو نمونەتان بۆ هێنایەوە ئێمەش ئەزانین ئەوەندەو چەندەهای ترتان هەیە بەلاّم درێژەتان پێدا وە خۆتان هێنایە سەر ئەو لایەنەی کە بەتەواوی سەرکەوتنو خاوەنی پلەی بەرزن و بەرامبەرەکەتان پلەی بەدەست نەهێناوە، بەلاّم ئێمەیش هەموو بەڵگەو نموونەکانمان ئەهێنین لەگەڵ نموونەو بەڵگەکانتان ئەیخەینە تەرازووی شەرع و ژیریەوە تا بۆمان دەرکەوێت باش لەباشتر بەلاّم بالەنێوانماندا دەربکەوێت و دەرچێت ئەو کەسەی کە شێوەی خۆی کردووە بەیەکێکی زۆر هەژارو کەمدەستی هەرچییەك پەیدا ئەکات ئەیخاتە سەریەك و

[182] رواه مسلم ٢٨٥٨ وصحيح إبن ماجة ٣٣٢١.

رژدی (پیسکە) و بێ سوود بۆ خۆی و خزم و خەڵکی وەبەرگی هەژاری پۆشیوە بۆ کۆکردنەوە زیاتر ئەگەر خوا پێی ببەخشێت پێخۆشحاڵە ئەگەر لێی بگرێتەوە وە نارەزایە، بێ ئاگا لـەخوداو دوای ئارەزووەکـانی دونیـای کـەوتووە یـاخود هەژارێکی نارازی لەسەر هەژاریەکەی بەردەوام نارەزایی دەردەبڕێـت بـەزمان و شێوە ئەگەر خوا شتێکی پێ ببەخشـێت رەزامەنـد وە ئەگـەر لێـی بگرێتـەوە نارەزایە، وە بەهەموو کاتێك هەوڵ دەدات بـۆ دونیـا، بـەڵام باسـەیرێکی بـرا پێشووەکانمان (کاتی پێغەمبـەر و یاوەرەکـانی) بکـەین کـە هـەموو ژیانیـان پێشـبڕکێی بـووە بـۆ رەزامەنـدی خـواو رۆژی کۆتـایی هـەر بەهـەژارو دەوڵەمەندییەوە: ئەوانە برا بڕوادارەکانمان کە خەڵکی دەربارەیان دەڵێن کامیان بەڕێزترین پلەیان بەرزترە لەکامیان هەژارانیان یا دەوڵەمەندیان؟! بـەڵام ئـەوان خۆیان سەیری ئەوەیان نەکردووە کامیان پلەیان بەرزترە لەکامیان بەڵکو سەیری ئەوەیان ئەکرد تا بزانن کامیان لەخوار کامیانەوەن لە پلەو سزای دوارۆژدا..

بەڵام لە قورئاندا لەچەندەها شوێندا باسی کردەوەی باش دەکات وە وەسفی خاوەنەکەی ئەکات وە ئەو کردەوانەش بەپارەو مـاڵ نـەبێت نایەتـە دی وەکـو (زەکات ، یارمەتی هەژاران ، و سەرفکردنی لەرێگەی چاکەدا وە خۆبەختکردن لەپێناوی خوا بەماڵ و ئامـادەکردنی پێداویسـتی شـەڕو بەنـدە ئـازادکردن و خواردن بەخشینەوە لەکاتی گرانیدا ئارامی هەژار لەکوێیە ئەگـەر دەوڵەمەنـد یارمەتیان نەدات و رزگاریان نەکات لەبرسییەتی و تینوییەتی و بێ پۆشاکی و ماندوویی، ئارامی هەژار لەکوێیە بەرامبەر سوودی دەوڵەمەنـد کـە هـەوڵی سەرکەوتن ئەدات لە پێناوی خوادا و دوژمن لەناو بردن و بەرزکردنەوەی ئاین و دامەزراندنی وڵات بۆ بەڕێوەبردنی فەرمان و یاساکانی پەروەردگار.

❖ ئارامیی ئەبوزەر لەکوێ لەسەر هەژاری وشوکرانەی ئەبوبەکر لـەکوێ؟ کە چەندەها بەندەی ئەکڕیو ئازادی ئـەکرد لەژێرسـزای بـێ باوەڕەکانـدا! وە سەرفکردنی ماڵ لەپێناوی سـەرکەوتنی ئیسـلامدا! وەك پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموێت: ماڵی هیچ کەس بەکەڵکم نەهات وەك ماڵی ئەبوبەکر[١٨٣].

❖ ئارامیی هەژارانی (أهل الصفة) لەکوێ و ئەو هـەموو سـەرفکردنی ماڵە لەپێناوی رێکخستنی سەربازانی ئیسلام بۆ پاراستنی دەوڵەتی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی ئاینی پیرۆز لەکوێ؟ وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئیمـامی عوسمان کەبەماڵەکەی سوپایەکی زۆری رێکخست دەفەرموێت: هەرچی بکات عوسمان لەمرۆوە بەدواوە زیان ناکات.[١٨٤] وە فەرموویەتی: خوالێت خۆش بێت ئەی عوسمان ئەوەی بە ئاشکرا ئەیکەیت و وە ئەوەی بەنهێنی.

❖ ئەگەر سەیرێکی قورئـان بکـەین ئـەبینین ئەوەنـدەی بـاس و وەسـفی چاکەکاران دەکات ئەوەندە وەسفی هەژارو ئارامگر ناکـات، وەك پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێت: ئـەو دەسـتەی لەسـەرەوەیە باشـترە لـەو دەسـتەی لەخوارەوەیە.[١٨٥] دەستی سەرەوە دەستی خێرەومەندەکەیە وە خوا بەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿ وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَىٰ ﴾[١٨٦] هەژارو کەمدەسـت بوویـت دەوڵەمەندی کردیت، بێگومان خوا لە چـۆنیەتیەکەوە پێغەمبـەر نابـات بـۆ چۆنیەتیەکی تر ئەگەر باشتر نەبێت، واتە هەژاری بـۆ دەوڵەمەنـدی. کەواتـە دەوڵەمەندی خێرەو باشترە. بەڵام عەمری کوڕی عاص تەفسیری ئـەم ئایەتـە

[١٨٣] كتاب فضائل الصحابة ـ إمام أحمد ٢٥ إسناده صحيح.
[١٨٤] صحيح الترمذي ـ الألباني ـ ٢٩٢٠ والحاكم ٣١٠٢ وصححه.
[١٨٥] البخاري ١٩٣/٢ ومسلم ٧٥/٣.
[١٨٦] سورة الضحى/ آية ٨.

بەم شێوەیە ناکات و بەرپەرچی دەداتەوە و دەڵێت: ئەو کاتە عەرەب بەگشتی بێ دەسەڵات و هەژار بوون ئەمە تێبینیەکە کە تێکەڵی باسەکەمان کرد.

❖ وە دەوڵەمەندی لەگەڵ سوپاس و ستایشی خوادا رێزو بەزەییە ﴿ وَاللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴾[١٨٧] وە هەر دەوڵەمەندە رەزامەندەکان دەبنە هۆی ئەوەی کە هەژارە ئارامگرەکان خواپەرستی بکەن بە یارمەتیدان و چاکەکردن لەگەڵیاندا وە یارمەتیدانیان بۆ خواپەرستی وە بێگومان پاداشتی دەوڵەمەندەکانیشی تێدایە بەبێ ئەوەی لەپاداشتی ئەوان کەم بێتەوە وەك رۆژوو شکاندنی رۆژوەوانێك رزگاربوونە لەدۆزەخ و لێخۆشبوونی هەیە لای خوا وە پاداشتی وەکو رۆژوەوانەکەیە.

❖ عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی رازی بێت دەفەرمویێت: خێروخێرات پاراستنی ئادەمیزادە لە ئاگر.

❖ وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمویێت: خێرو خێرات سزای گۆڕ سارد دەکاتەوە لەسەر خاوەنەکەی وە دەبێتە سێبەر بۆی لە رۆژی دواییدا، لەژێریدا پشوو دەدات تا رزگاری ئەبێت لە دادگا.

❖ وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویێت: خێرو خێرات هەڵەو خراپە لا دەبات وەك ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە[١٨٨].

❖ وەهەموو خێرو چاکەیەك بەلا دەگێرێتەوە وە ئەگەر خوا خۆش بووبێت لەیەکێك لەبەر ئەوەی سەگێکی تینوی تێر ئاو کردبێت دەبێت پاداشتی ئەوانە

---

[١٨٧] سورة البقرة/ آية ١٠٥.
[١٨٨] ضعيف سنن إبن ماجة الألباني برقم ٩٢٢ وضعيف برقم ١٩٠١.

چۆن بێت کە چەندەها ئادەمیزادیان لەبرسیەتی و تینویەتی و بێ بەرگی رزگار کردووە.

❖ وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:[189] خۆتان بپارێزن لـەدۆزەخ ئەگـەر بەلەتە خورمایەکیش بێت ئەگەر نەتان بوو بە وتەو قسەیەکی بـاش. ئەگـەر نەیان بوو بەماڵ ئەوە بابە قسە بێت. کەواتە ماڵ لە پێشترە سەرەرای ئـەوەی کە چەندەها جار خوا خۆشەویستی خۆی دەردەبڕێت بەرامبەر بە خێرکـردن و یارمەتیدان وە هەر بەبۆنەی ماڵەوە برایەتی و دۆستایەتی پێك دێت.

❖ وە لەیارمەتیدانی خەڵکیدا سوودێکی زۆری تێدایە کە ناژمێدرێت وەك ئیبراهیمی نەخعی خوا لێی رازی بێت دەڵێت: خێرو خێرات سـتەم لەسـەرت لادەبات وە تاوان لا دەبات وە ماڵ دەپارێزێت وە رۆزی زیاد دەکات وە دڵـت خۆش دەکات وە دەبێتــە شـوێنی بـڕواو گومـانی باشـی خـەڵکی و دوورت دەخاتەوە لەخراپە هەروەك پیسکەی ئەبێتە هـۆی شـوێنی گومـانی خراپـی خەڵکی وە هەموو چاکەیەکت لەناودەبات و دڵگران و بەرچاوتەنگ دەبیت.

❖ چاکەکردن شەیتانت لێ دوور دەکەوێتەوە دڵ و دەروونت پاك دەبێـت و خۆشەویست ئەبیت لای خواو خەڵکی وە دەبێتـە هـۆی شـاردنەوەی هـەموو ناتەواویەکت وە تەمەنت زیاد دەکات و ئەبێتـە نـزای خێـری خـەڵکی بـۆت لەرۆژی دواییدا وە داوای لێخۆشبوونت بـۆ دەکـات لای خـوا ئینشـائەڵڵا وە دەبێتە هۆی لابردنی هـەموو خراپەیـەك لـەدونیا و رۆژی دواییـدا وە هانـت دەدات بۆ کردنی چاکەی زیاتر. وە سەرەرای ئەوەی هەرچاکەیەکی پێ بکەیت لە رۆژی دواییدا بەو وێنەیە پاداشتت دەدرێتەوە.

---

[189] مسلم ٧٠/١ والترمذي ١٤٩/٤ وأحمد ٣٥٩/٤.

❖ وە پێغەمبەر (ﷺ) لەچەندەها فەرموودەدا ئاگادارمان دەکاتەوە هەرکەس پۆشاکێك بۆ موسوڵمانێك بکات خوا لە پۆشاکی رازاوەی بەهەشت ئەیپۆشێ وە هەرکەسێك برسییەك تێر بکات خوا لەمیوەی بەهەشت تێری دەکات وە هەرکەسێك بەندەیەکی ئازاد بکات خوا هەموو ئەندامەکانی لەشی ئەو کەسە رزگار دەکات لە دۆزەخ دەست بەدەست و قاچ بەقاچ.. وە هەرکەسێك نارەحەتیەك ئاسان بکات لەسەر موسوڵمانێك خوا لەنارەحەتی دونیاو رۆژیی دوایی رزگاری دەکات وە هەرکەسێك بەڵایەك لەسەر موسوڵمانێك لابدات خوا لە قیامەت ئەیپارێزێت خوا لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە بەردەوام لەگەڵ براکەیدایە بە یارمەتی. ئەمانە هەمووی فەرموودەو وتە جوانەکانی پێغەمبەرن (ﷺ) وە ئەمانە هیچی بەماڵ و سامان نەبێت نایەتە دی، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە دژایەتی ئارامی هەژاران ناکەین بەڵام ئارامگرتن لەکوێ و ئەم پلە بەرزانە لەکوێ کە بەبۆنەی دەسەڵاتی دونیاوە دێتە دی؟!

❖ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: چاوتێبڕین (حسود)ی لەدوو شتتدا نییە پیاوێك قورئانی لەبەر بێت بەشەو و رۆژ نوێژ بکات وە تێیدا بیخوێنێت وە پیاوێك خوا سامان و ماڵی پێ ببەخشێت و شەو و رۆژ خەریکی بەخشینەوەی بێت لەپێناوی خوادا.[190] لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) دەوڵەمەندی و بەخشینەوەی لەپێناوی خوا خستوەتە ریزی قورئان و شەونوێژ و.. بێگومان هەروەك لەفەرموودەکەی پێشوودا کەباستان کرد کە دەوڵەمەند دەوڵەمەندییەکەی بە زانستەکەی بەکار ئەهێناو باشترین شوێنی بوو لای خوا بەڵام هەژارە کە بەزانستەکەی خۆزگەی پێدەخواست و نیەتی وابوو ئەگەر

[190] رواه البخاري ٦٥/٩ ، وصحيح سنن إبن ماجه ٣٣٩٣ ومسلم.

ئەویش دەوڵەمەند بوایە وەکو ئەو ئەبوو لێرەدا هـەردووکیان پاداشـتیان وەك یەکـە لەسـەر کـردەوەو نیـەت وەئـەوەیش بـزانین دەوڵەمەندەکـە کـردەوەو نیەتەکەی هەیە بەڵام هەژارەکە نیتەکەی هەیە لەگەڵ وتنیدایە بـەزمان ئـیتر کردەوەی نییە کەواتە بنەڕەتی پاداشت بۆ دەوڵەمەندەکەیـە لەگـەڵ ئەوەشـدا پاداشتیش هەیە بۆ هەژارەکە لەسەر نیەتەکەی بەڵام پاداشت لای خوا پلـەی زۆری هەیە هەروەك یـەکێك نیـەتی هـەبێت بچـێت بـۆ حـەج وە بەتـەواوی حەجەکە بکات لەگەڵ ئەوەشدا لەپێشدا نیەتی هەبووە لێرەدا ئەوەی چووە بۆ حەجەکە بە نیەتەکەوە پاداشتی زیاترە لەوەی کـە بـەس نیەتەکـەی هەیـە و ماڵی نییە پێـی بـڕوات بۆحـەجکردن پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێت: ئـەو کەسەی بەدڵێکی تەواو ئاواتی ئەوە بێت بەپلەی شەهیدی بگات بەخوا پلەی شەهیدی پیٛ دەبەخشێت ئەگەر لەسەر جێگـادا بێـت[١٩١]. واتـە پلەیـەك لـە پلەکانی شەهیدی پێدەبەخشێت کە سەد پلەیە ئیتر وەك پێغەمبەر هـەواڵمان پیٛ ئەدات پاداشتی خێر لەیەکەوە تا دەو تا سەد لەسەدەوە تا حـەوت سـەد زیاتریش بەگوێرەی نیتەکەی.[١]

❖ هەروەها کاتێك هەژارەکان گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) وتیـان: ئەو زیکرەی بە ئێمەت پێشاندا لەدوای نوێژەکەوە بیکەین پاداشـتمان هەیـە وەك پاداشـتی کـردەوەی دەوڵەمەنـدەکان ئێسـتا دەوڵەمەنـدەکان ئەمـەیان بیستووە ئەوانیش سەرەرای کردەوەکانیان ئەم زیکرانە دەخـوێنن، پێغەمبـەر

---

[١٩١] رواه مسلم ٤٩/٦.

[١] هەروەك چۆن خوا دەفەرموێت ﴿ مَثَلُ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِئَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ سورە البقرە/ ئایە ٢٦١.

(ﷺ) فەرمووی: ﴿ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ ﴾ ئەوە ریزو پلەیەکە خوا دەیبەخشێت بەهەرکەسێك ویستی هەبوو.. بەڵام لەگێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەر دوای ئەوە پێیان دەفەرموێت: ئەی مژدەتان نەدەمێ کە هەژارە موسڵمانەکان لە پێش دەوڵەمەندە موسوڵمانەکاندا دەچنە بەهەشتەوە بەپێنج سەد ساڵ[١٩١] کەواتە لێرەدا هەژارەکان لەجیاتی ئەو کردەوەی دەوڵەمەندانە خاڵێکی تریان هەیە ئەویش ئەوەیە لەپێش دەوڵەمەندەکانەوە دەچنە بەهەشتەوە بەسەلامەتی بەڵام لەبەر نەبوونی دادگایی و لێپرسینەوەی قورس بەسەریانەوە نەك پلە بەرزی دەوڵەمەندی مایەی خێرە بۆیە خوا بەخێر ناوی دەبات ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ ... ﴾[١٩٢] ئەگەر یەکێك لەسەرەمەرگدا پارەو ماڵ و خێرێکی بەجێهێشت بۆ ئەوانەی دوای خۆی. وە دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّهُ لِحُبِّ الْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ﴾[١٩٣] وە ئەگەر پارەو ماڵ و هۆیەکی سەرەکی نەبێت بۆ هەڵسوراندنی ژیان خوا فەرمانی نەدەدا کە بیپارێزێت لەدەستی مندڵ و شێت و تێکچوو وەك پێغەمبەر (ﷺ) بەسەعدی فەرموو: ماڵی باش بۆ پیاوی باش[١٩٤].

وە سەعیدی کوڕی موسەییب خوا لێی رازی بێت دەڵێت: ئەو کەسە خێری تێدا نییە کە نایەوێت پارەو ماڵ کۆبکاتەوە تا یارمەتی خزم و کەسوکارو خەڵکی پێبدات وە مافی خوای لێبدات.[١٩٥]

---

[١٩١] وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّ يَوْمًا عِنْدَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ ﴾ سورة الحج/ آية ٤٧.

[١٩٢] سورة البقرة/ آية ١٨٠.

[١٩٣] سورة العاديات/ آية ٨.

[١٩٤] صحيح المسند مقبل بن ربيع الوادعي ١٠٠٩ وصححه الألاني مشكلة الفقر ١ غاية المرام ٤٥٤ وأحمد في فضائل الصحابة ١٧٤٥.

[١٩٥] تلبس إبليس إبن الفرج الجوزي ص١٨١.

وه خوای گەورە خێرو بەخشندەی خستۆتە پێش کارە چاکەکانی ترەوە ﴿ إِنَّ الْمُصَّدِّقِينَ وَالْمُصَّدِّقَاتِ وَأَقْرَضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ﴾[195].

سوفیانی سەوری خوا لێی رازی بێت دەفەرموێت: سامان و ماڵ لە ئەمڕۆی ئێمەدا چەکی موسڵمانە.[illegible]

واتە وەکو چەك بەکاردەهێنرێت بۆ خۆپاراستن ئەمانە هەمووی بەڵگەن لەسەر باشی دەوڵەمەندی بەڵام نەك دەوڵەمەندییەك نەزانێت چۆن سەرفی بکات وه ئەیدات بەخاوەنی راستی خۆی وه هەردەم دڵی بەدەوڵەمەندییەکەیەوە بەستراوبێت تا لێی کەمەوە نەبێت، بێئاگایی کردووە لەخواو رۆژی دوایی وه هەر سەرفی بکات لەپێناوی نەفس و ئارەزووەکانی دنیادا.

هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: لەناوچێت بەندەی دینار و درهەم ئەگەر زیادبوو پێی خۆشەو ئەگەر کەمی کرد نارەزایە.[196] هەر بەبۆنەی ماڵەوە دەتوانیت خواپەرستی بکەیت و حەج و خۆبەختکردن و مزگەوت کردنەوەو بەندە ئازادکردن وەهەر بەماڵ ئەتوانیت ژنی پێبهێنیت کە یارمەتیت ئەدات بۆ ئەوەی ئیمانت پێی دابمەزرێت وه باشترە لە نوێژی سوننەت وه هەر بەبۆنەی دەوڵەمەندییەوە سیفەتی بەخشندەیی و سەربەرزی ئەبێت وه ئەبێتە هۆی دۆستایەتی و خۆشەویستی وه هۆی گەیشتن بە پلەی بەرزی رەزامەندی خوا.

---

[195] سورة الحديد/ آية ١٨.

[illegible] تلبس إبليس إبن الفرج الجوزي ص١٨١.

[196] رواه البخاري ١١/ ٢٥٣ صحيح سنن إبن ماجة ـ ألألباني ٣٣٣٦.

هەروەك هەندێ لە سەلەف فەرموویانە پلە بەرز لای خوا بەدەست ناهێنیت ئەگەر بەکردەوە نەبێت وە کردەوەش بــەس بــەماڵ دەکرێـت. وە هەنـدێکیان فەرموویانە ئەی خوایە من لەو بەندانەتم کە بەس دەوڵەمەندی بەکەڵکم دێت. هەروەك قەیسی کوڕی سەعد ئەم داواکارییەی وتووە. بەڵام هەندێکیش وەکو ئەبوزەر و هاوڕێکانی کەمدەستی و هەژاریان هەڵبژاردووە بۆخۆیان. وە هــەر بەو ماڵە ئەچێتە بەرزترین پلەی بەهەشتەوە وە هەر بەو مـاڵـەیش ئەکەوێتـە ناوەڕاستی دۆزەخەوە وەکو ئەو سـیانەی کـە خـوا تاقیکردنـەوە (کوێرەکـەو گولەکەو کەچەڵەکە) لە ئەنجامدا تەنها کوێرەکە دەرچوو لەبەرئەوەی سوپاسی خوای کرد. وە ئەیزانی ئەمە خوا پێی بەخشیوە.

خۆبەختکردن (جهاد) بەرهەمی هــەرە لوتکـەی کردەوەیــە خۆبــەختکردن (جهاد) بەماڵ و سامان دەکرێت لەگەڵ دەروونداو وەهەندێ جاریش ماڵ باشترە لە دەروون (نفس). هەروەك ئیمامی عوسمان خوا لێی رازی بێت پلەو پایــەی بەرزترە تا ئیمامی عەلی خوا لێی رازی بێت کــە زووتــر موســڵمان بــووە وە بەردەوامیش بەشداری جیهادی کردووە لەبەرئەوەی ئیمامی عوسمان خوا لێــی رازی بێت بەپارەوماڵ سەدەها خۆبەختکەری (مجاهــد)ی رێکدەخســت بــەڵکو سوپایەکی ئەرازاندەوە بەهەموو پێداویستییەکانی شەڕەوە.

❖ زوبێری کوڕی عەوام و عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف زۆر بەرێزتر بــوون لە زۆری هاوەڵەکان (أصحاب) و (أهل الصفة) هــەژارەکانی مەککـە لــە سوچێکی مزگەوتەکەدا بوون لەبەر ئەوە زوبێــر و عەبــدولرەحمان دەوڵەمەنــد بوون و لەپێناوی خوادا و بەرزکردنەوەی ئاینیدا ســەرفیان ئــەکرد و هــەوڵیان

دەدا. وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: هەرکەسێك ماڵ و منداڵی بەدەوڵەمەندی بەجێبهێڵێت باشترە لەوەی بەهەژاری بەجێیان بهێڵێت.

❖ هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) بە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص فەرمووی: ئەگەر خێزانەکەت بەدەوڵەمەندی بەجێبهێڵێت باشترە لەوەی بەهەژاری بەجێیان بهێڵێت وە دەست لە خەڵکی پان بکەنەوە.[197]

❖ وەجارێك باسی پیاوێکیان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە کە بەرۆژوو بوو وە بەشەویش شەونوێژ دەکات هەرخەریکی خواپەرستییە. فەرمووی: کێ خزمەت و خواردنی ئەدات؟ وتیان: براکەی. فەرمووی: براکەی باشترە لەو (واتە خێر و چاکەی زیاترە لە براکەی تری). وە دەفەرموێت هیچ باشە و چاکەیەك نییە لەوکەسەدا کە حەز لەماڵ ناکات تاوەکو یارمەتی خزمەکانی بدات و پێ سپاردەکانی پێ بداتەوە وە پێویستی بەیارمەتی بەندەکانی خوانەمێنێت.

❖ وە ئەفەرموێت: هەرکەسێك پێویستیەك لاببات لەسەر برایەکییەوە لەدونیادا خوای گەورە حەفتا پێویستی لا ئەبات بەسەریەوە لەرۆژی دواییدا.

❖ وە دەفەرموێت: خوا موسوڵمانی خاوەنکاری خۆش دەوێت[198]. وە پێغەمبەر (ﷺ) لەزۆر پاڕانەوەدا داوای لەخوا کردووە لە هەژاری بیپارێزێت وەك دەفەرموێت: (اللهم إني أعوذ بك من الكفر والفقر)[199]. واتە:

[197] البخاري ١٣٢/٣ ومسلم ١٦٢٨.
[198] كتاب الفتوحات الربانية بالخطب والمواظع القرآنية. محمد سالم البيماني ص١٠٨.
[199] صحيح سنن أبي داود ٩٥٩/٣.

خوایە بمپارێزیت لەبێباوەڕی و هەژاری. وە هــەر هەژاریــە ئەبێتــە هــۆی بــێ باوەڕی.

وەلەگەڵ ئەوەشدا دژایەتی ئەوە ناکەین کە پێغەمبەر (ﷺ) هەژار بووە و خوا دەوڵەمەندی کردووە وە دەرگای بەزەیی بۆ کردوەتەوە، هەروەك خواردنی ساڵێکی ئەدا بە خێزانەکانی وە بەشی هەبووە لەوشتانەی کەلەشەڕدا گیراوە وەك دەفەرمویّت: ﴿ مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ ﴾[٢٠٠] وە پێغەمبــەر (ﷺ) لــەخوای خــۆی پاڕایــەوە کــە موســوڵمانان بــەگرانی لەناونەچن.[٢٠١]

ئەگەر دەوڵەمەندی سوپاسگوزار بەڵگــە بێنێتــەوە لەســەر ژیــان و حــاڵی پێغەمبەر (ﷺ) لێی تێناگات و نایەتە دی هەتا ئەو کردەوانە نــەکات کــە پێغەمبەر (ﷺ) کردوویەتی وە ئەگەر هەژاری ئارامگریش بەڵگە بێنێتــەوە لەسەر ژیان و حاڵی پێغەمبەر (ﷺ) لێــی تێناگــات و نایەتــە دی تــا ئــەو کردەوانە نەکات کە پێغەمبەری خوا کردوویەتی..

هاوڕێیانی بەڕێز: هەژارانی ئارامگر باسی دوورکەوتنەوە و (زهد)[٢٠٢] تان کرد لەدونیا بەڵام زوهــدو دوورکەوتنــەوەی دەوڵەمەنــد لەخراپــە پلــەی بــەرزترە لەبەرئەوەی لەبەردەستایەتی و دەسەڵاتی هەیە بەسەریا و نایکات بەڵام هەژار نیەتی و دەسەڵاتی بەسەردا نییە گرنگی بەلایەنی دونیاش نەدات لەبەرئــەوە کە نیەتی.

---

[٢٠٠] سورة الحشر/ آية ٧.

[٢٠١] رواه مسلم.

[٢٠٢] زهد: واتای ئەوەیە خۆت بپارێزیت لەزۆر گرنگی نەدان بەجلوبەرگ و خواردنەوە و ئارەزوواتی دنیا.

❖ له پێغەمبەر (ﷺ)ەوە دەگێڕنەوە: زوهد لەدنیادا ئـەوە نییـە حـەڵاڵ حەرام بکرێت، لەناوی بدەی، زوهد ئەوەیە پشت بەخوا ببەسـتێت لـە رزق و رۆزی دونیادا و پشت بەخۆت نەبەستیت ئەگەر بەڵات بەسـەرەوە بـوو لەبـەر پاداشتی حەز بکەی بەسەرتەوە بێت.[202]

❖ پرسیارن کرد لە ئیمامی ئەحمەد خوا لێی رازی بێـت: ئەگـەر یـەکێك هەزار دیناری هەبێت ئایا زوهدی تێدایـە؟ وتـی: بـەڵێ بەمـەرجێك ئەگـەر زیادبوو پێی خۆش نەبێت وە کەم بوو پێی ناخۆش نەبێت.

❖ وە زانای بەرز ئیبن تەیمیە خوا لێی رازی بێت دەفەرموێت: زوهد ئەوەیە دووربکەویتەوە لەوەی کە بەکەڵکت نایەت وە وەرعیش ئەوەیە دووربکەوێتەوە لەوەی زیانت پێ دەگەیەنێت.

❖ وەهەندێك دەفەرموون: خاوەنی زوهد ئەو کەسەیە کە زۆربوونی حەڵاڵ نەبێتە هۆی بێ ئاگایی لە سوپاسگوزاری یـان وە رووتێکردنـی زۆری حـەرام نەبێتە هۆی نەمانی ئارامیان، کەواتە بڕواداری بە هێزو توانا خۆشەویسـت و چـاکترە لای پـەروەردگار، وە ئـیتر بـزانین چ لایـەك بـەتوانا و کارمەنـدترە لەکارەکانیاندا خوای گەورە یارمەتی هەموو لایـەك بـدات بـۆ کـاری خێـرو چاکەو وەرگێراو.

## هەڵسەنگاندنی باسەکە:

[202] ضعيف الترمذي الألباني رقم ٤٠٥، وضعيف إبن ماجة الألباني رقم ٤١٠٠، وضعيف الجامع الصغير ٣١٩٤.

لەدوای باسی بابەتەکـە بەشـێوەیەکی دوورودرێـژ لەهـەردوولادا لـەنێوان هەژارەکان و دەوڵەمەندەکاندا یاخود ئارامگرتن و سوپاسگوزاری پێویستی بەوە هەیە کە خوێنەر بۆی یەك لابێتەوە کام لایەن پلەی بەزترە و یاخود باشترە لەوی تریان.

ئیمامی ئیبن قەیم هەڵدەستێت بەگونجاندن و هەڵسەنگاندنی بابەتەکە وەکو ئەنجامێکی زانیاری بۆ یەکلاکردنەوەی باسەکە لەگـەڵ رەچـاوکردنی پلـەوکاری هەردوولادا وە دەفەرموێت:

نهێنی بابەتەکە ئەوەیە کە: رێگەی هەژاری و نەداری رێگەیەکی سەلامەت و دوور لە هەموو ئاڵۆزییەکە، وە رێگـەی دەوڵەمەنـدی بـوون رێگەیـەکی پـڕ ئاڵۆزی و لێپرسینەوەیە وە ئەگەر بێتو مافی خـوای تێـدا بـدات و یارمـەتی نەداران و لێقەوماوان و .. بکات ئەوا رێگەکـەی رزگـاربوون و بەدەسـتهێنانی هەموو خێرێکە کە ئەم رێگەیە لەسەروو رێگـەی سـەلامەتی هەژارەکانەوەیـە بەڵام رێگەکە پڕە لەترسناکی وە ئاگالێبوونێکی وردی دەوێت بۆ کۆکردنـەوەی سامان و سەرفکردنی کەواتە هەژارەکە وەکو نەخۆشێك وایە کە نەخۆشـیەکەی نایـەڵێت تووشـی تـاوان ببێـت وە دەوڵەمەندەکـە وەکـو موجاهیـدێك و مامۆسـتایەکی خێـر لـەناو خەڵکیـدا وایـە پێویسـتی بـە زۆر وردەکـاریی و بەئاگابوون هەیە.. وە پرسیاریش بکرێت کامیان پلە بەرزترە و باشـترە، ئەمـە وەکو پرسیارکردنە لەخواردن و خواردنەوە کە بەبێ یەك نابن کەواتە بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوا نایەتەدی بە (صبر و شکر) نەبێت وە هەروەها خۆپاراستن لـە قەدەغـەکراوەکانی خـوا نایەتـە دی بـەبێ (صـبر و شـکر) ئـارامگرتن و سوپاسکردنی خوا نەبێت وە هەربەلایەك بەسـەر هەرکەسـێکدا بێـت ئـارامی

لەسەر گرت مانای سوپاسی خوای لەسەر کـردووە، واتــە ئـەنجامی ئـارامی و یەکەی شوکرە کەواتە هەرسێ بەشەکەی (صبر) کە ئەم سیانەی پێشوو بوو (أمر و نهی و مصائب) (صبر و شکر) ئارامی و سوپاسکردن تێکەڵیانە وە پەیوەست و نەپچڕاون بەیەکەوە، دەرکەوت دوو بابەتەکە زۆر لەیەکەوە نزیکن جیاوازیـان ئەوەندە نییە بەڵکو تەواوکەری یەکن، بەڵام پرسیارێکی تردێتە پێشـەوە: ئایـا ئەگەر هەردووکیان لـەرێكو هاوێنـەی یەکتریـدا بـوون کامیـان باشـترە واتـە دەوڵەمەند کە کەسێکی باوەڕداربوو خواناس بوو لەکردەوەکانیدا و هەژارەکەش بەهەمان شێوە کەسێکی بـاوەڕدار و خوانـاس بـوو لـەکردەوە و ژیـان دا ئایـا کامیان پلەو پایەیان بەرزترە؟

وەڵام: ئەو کەسەیانە کە زۆر گرنگی دەدات بەفەرمان و سونەتەکانی واجب و مندوب تیایدا واتە زیاتر فەرمانەکانی خوا و سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) تێدا رەچاو دەکات وەك خوا دەفەرموێت ﴿ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ﴾[203] وە پلە بەرزیەتی لای خوای گەورە ئەگەڕێتەوە بۆ بەڕیوەبردنی کارەکە بە (واجب و مندوب)ەکان وەکو پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرموودەیەکی قودسیدا دەفـەرموێت: (ماتقرب إلي عبد بمثل مداومةماافترضت عليه ولايزال عبدي يتقرب الي بالنوافل حتى أحبه)[204].

واتە: بەندەیەك لەمن نزیك نابێتەوە بەوێنەی ئەوانەی کە فەرمان و واجـبم کردووە لەسەری وە بەردەوام لەمن نزیك دەبێتەوە بەکردنی سـوننەتەکان هـەتا خۆشم دەوێت کەواتە هـەر کامێکیـان زیـاتر وردتـر فـەرمان و سـوونەتەکان

[203] سورة الحجرات/ آية ١٣.
[204] البخاري ٢٩٢/١١.



بەڕێوەبرد ئەوەیان بە (تقوی) و خواناسترە و پلەی بەرزترە لەوی تریان ﴿ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ﴾ وە ئەگەر هەردووكیان بە تقوی بوون ئەوا هەردووكیان باش و پلە بەرزن، وە بەڵگەیەكی بەهێزترمان بۆ ئەم بابەتە ژیانی دوو پێغەمبەری خوان علیه السلام كە یەكەمیان سولەیمان علیه السلام كە پاشا و دەسەڵاتدارو بەهێزبوو تەنانەت باڵندەو جیهانی جنی بۆ تەرخانكرا بوو لەژێر دەسەڵاتیدا سەرەرای ئەم هەموو بوون و دەسەڵاتە پێغەمبەرێك و خواناسێكی پەروەردگار بوو خوای گەورە وەسفی دەكات دەفەرموێت: ﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُودَ سُلَيْمَانَ نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ ﴾[205] واتە سولەیمان باشترین بەندە بوو لەبەرئەوەی باشترین خواناسی و گوێڕایەڵی و پشت بەستن بەخوای خۆی تێدا بوو وە ئەیفەرموو: ﴿.. قَالَ هَذَا مِنْ فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ﴾[206].

دانی بەوەدا نا كە هەموو نیعمەتی خوایە و بۆ تاقیكردنەوەیەتی ئەگەر هەردەوڵەمەندێك خواناس بێت بەباشی ئەوا وەكو سولەیمان (علیه السلام)ە.

وە پێغەمبەری دووەمان (ایوب) علیه السلام كە خاوەنی ١٨ ساڵ و بەڵاو ناخۆشییەكانی ژیان بوو ئارام گرێكی بەناوبانگ بوو وە خوای گەورە وەسفی ئارامە پڕ خواناسییەكەی دەكات بەهەمان شێوازی وەسفی سولەیمان علیه السلام وە دەفەرموێت ﴿ إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِرًا نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ ﴾[207].

أیوب علیه السلام نموونەی هەژارە خاوەن بەڵاو ناخۆشیەكانی ژیانە، لێرە بۆمان دەردەكەوێت كە (صبر و شكر) هەردووكیان لای خوای گەورە پلەو پایە بەرزن وە كامیان زیاتر رۆچوو بێت لەخواناسیدا ئەوەیان لای خوای گەورە و

---

[205] سورة ص/ آية ٣٠.
[206] سورة النمل/ آية ٤٠.
[207] سورة ص/ آية ٤٤.

باشترین بەندە و خواناسە وە ئەگەر هەردووکیانی هەبێت ئەوا هەردووکیان وەك بینیمان خوای گەورە بەیەك شێواز باسو وەسفی (سولەیمان و ئەیوب)مان بۆ دەکات کە باشترین خواناس بوون (نعم العبد إنه أواب) بۆ هەردووکیان ئەم شێوە بەکاردەهێنێت کەواتە (صبر و شکر) هۆکارێکن بۆ تاقیکردنەوەی ئادەمیزادو بەدەست هێنانی پلەی بەرز لای خوای گەورە وە هەریەکەیان رێگەیەکن بۆ کۆمەڵە کەسێك وەکو هەموو جۆرەکانی پەرستن (عبادە) وەك سولەیمان علیه السلام فەرمووی (ليبلوني ـ أشكر) خوای گەورە تاقیم دەکاتەوە تاکو سوپاسی خوا ئەکەم یان نا؟

وەخوای گەورە هەردووکیانی بەتاقیکردنەوە باسکردووە ﴿ فَأَمَّا الْإِنْسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ (١٥) وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ ﴾[٢٠٨] وە دەفەرموێت ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾[٢٠٩].

وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (عجبت لأمر المؤمن ...) سەرسامم لەکاری موسوڵمان هەموو کارێکی بۆ ئەو خێرە ئەگەر نیعمەتی بەسەردا برژێت سوپاسی خوای لەسەر دەکات بەخێر بۆی دەنوسرێت وە ئەگەر ناخۆشی بەسەردا بێت ئارام دەگرێت و هەر بۆ ئەو خێرە..)[٢١٠].

وەك سوفیانی سەوری خوا لێی رازی بێت دەفەرموێت: کەسێك شارەزا نییە لە دین کە بەڵا بەنیعمەت و بەبەخشندە نەزانێت وە خۆشی ژیان و نیعمەت بە موصیبەت و بەڵا نەزانێت. کەواتە هەردووکیان مایەی پاداشتن لەبەرئەوە

[٢٠٨] سورة الفجر/ آية ١٥ـ١٦.
[٢٠٩] سورة الكهف/ آية ٧.
[٢١٠] رواه مسلم ١٨/١٢٥.

ئەبینین لەهەردوو جۆرەکە لە ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) هەبوو وەك سەردەمی مەککە لەناخۆشیدا وە سەردەمی مەدینە لە خۆشیدا. لەهەردوو جۆرەکەدا تەواو رەزامەندی و خواویستی تێدا بەرێوە بردووە، وە لە یارەکانیشیدا هەردوو جۆرەکەی تێدا بووە وەکو ئەبو زەرو هاورێکانی وەك بیلال و ئەبوهورەیرەو سەلمانو.. هتد. خوایان لێ رازی بێت لە هەژاریدا، وە وەکو ئەبوبەکر و عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف و عوسمانی کوڕی عەفان و زوبێری کوڕی عەوام لە دەوڵەمەندیدا.

لەگەڵ ئەویشدا خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ﴾.[211] خوا لێیان رازییە لەبەر خواپەرستی و خواناسییەکەیان هەریەکەیان لەبواری خۆیدا.

وە سەرەرای ئەمانەش خوای گەورە خۆی بەبەزەیی و زانایە بەسەر بەندەکانیدا کە هەریەکەیان چی بەکەڵکی دێت لەهەژاریو دەوڵەمەندی لەدونیادا وە هەر ئەو (خبير ، عليم ، حكيم) زانا و دانا و کاربەجێیە و بەئاگایە بەسەر بەندەکانیدا..

وە ئەمەیش لەلایەکی ترەوە بەڵگەیە کە ئیسلام هیچ لایەنێکی بەرنەداوە لە ژیان و دونیاداو گرنگی داوە بەهەموو لایەك کە بەرژەوەندی ئادەمیزادی تێدا بێت، وە ئیتر خوای گەورە یارمەتی هەموو لایەك بدات بۆ کاری پەسەندو وەرگیراو بێ بەشمان نەکات لەپاداشتی رۆژ دوایی وە خوای گەورە یارمەتی هەژاران و دەوڵەمەند و هەموو جۆرە ئیماندارێك بدات (اللهم آمين)...

[211] سورة البينة/ آية ٨.

(اللهم اجعل عملي صوابا واجعله خالصا ولاتجعله لأحد فيه شيئا) سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك

٤/رجب/ ١٤١٤ کۆچی

٢٤/١٠/١٩٩٤ زاینی

# پێڕست

**بابەتەکان** **لاپەڕە**

## وتە بەنرخەکان

- ☑ قال بعض الصحابة: (كنا ندع سبعين بابا من الحلال مخافة أن نقع في باب من الحرام).مدارج السالكين ٢/ ٢٥
- ☑ قال الفضيل: (ترك العمل من أجل الناس رياء والعمل من أجل الناس شرك والإخلاص أن يعافيك الله منهما). مدارج السالكين ٢/٩٢
- ☑ قال الحسن البصري: (المؤمن يعمل بالطاعات وهو مشفق وجل خائف والفاجر يعمل بالمعاصي وهو آمن). تفسير إبن كثير ٢/٨٥
- ☑ قال إبن القيم: (الإخلاص عدم إنقسام المطلوب والصدق عدم إنقسام الطلب). مدارج ٢/٩٢
- ☑ قال الجنيد: (الصادق يتقلب في اليوم أربعين مرة والمرائي يثبت على حالة واحدة أربعين سنة). مدارج ٢/٨٥

☑ قال عبدالقادر الجيلاني: (كن مع الحق بلا خلق ومع الخلق بلا نفس). مدارج ٣٢٦/٢

☑ قال إبن مسعود: (أنتم في زمان يقود الحق الهوى وسيأتي زمان يقود الهوى الحق). القرطبي ١٦٧/١٦

☑ قال إبن عباس: (أول ما ضرب الدرهم الدرهم أخذه إبليس فقبله ووضعه على عينه وقال بك أطغى وبك أكفر). تلبيس إبليس ٣٩٦

☑ قال بعض السلف: (لايشم رائحة الصدق من داهن نفسه أو غيره). مدارج ٢٨٥/٢

☑ قال بعض السلف: (التوكل إضطرب بلا سكون وسكون بلا إضطراب). مدارج ١١٢/٢

☑ قال بعض السلف: (ماأمر الله بأمر إلا وللشيطان فيه نزغتان إما الى التفريط وإما الى الإفراط). مدارج ١٠٥/٢

☑ قال بعض السلف: (الإقتصاد على السنة خير من الإجتهاد في البدعة) مدارج ١٠٥/٢

☑ قال مسروق: (كفى بالمرء علما أن يخشى الله وكفى بالمرء جهلا أن يعجب بعمله). رواه الدرامي ٩٣/١

☑ وقال عمر بن الخطاب: (عليكم بذكر الله فإنه شفاء وإياكم وذكر الناس فإنه داء).

☑ قال بعض السلف: (لمصانعة وجه واحد أيسر عليك في مصانعة وجوه كثيرة ذلك الوجه الواحد كفاك الوجوه). مدارج ٢٩٥/٢.

